# کۆنفۆشیانیزم

د. فەیاز قەرایی



وەرگێڕانی

پێشڕەو محەمەد

بۆ

سەنگەر عەلی

و

ڕێبوار عوزێر

د. فەیاز قەرایی

# کۆنفۆشیانیزم

# Confucianism

وەرگێڕانی

پێشڕەو محەمەد

٢٠١٣

قەرایی، فەیاز

کۆنفوشیانیزم/ فیاز قەرایی، وەرگێڕانی پێشڕەو محەمەد،    :   ، ٢٠١٣

١.ئـایین و فەلسـەفە ٢. کۆنفوشـیانیزم ٣. هـزری خۆرهـەڵاتی دوور. ئـەلف. محەمەد، پێشڕەو، ١٩٨٨-        ، وەرگێڕ.

## خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

- کۆنفۆشیانیزم (Confucianism)
- د. فەیاز قەرایی
- وەرگێڕانی: پێشڕەو محەمەد
- نەخشەسازی بەرگ و ناوەوە: ڕێدار جەعفەر
- نرخ: ٢٠٠٠ دینار
- چاپی یەکەم: ٢٠١٣
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانەی: موکریانی (هەولێر)
- لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٨٣١) ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە.

MUKIRYANI

ESTABLISHMENT FOR RESEARCH & PUBLICATION

زنجیرەی کتێب (٧٥٣)



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

## تێبینی

دەمێك بوو ئاواتەخوازبووم كارێك لەبارەی ئایین و فەلسەفەكانی خۆرهەڵاتی دوور ئەنجام بدەم، چونكە دەمبینی تا ئێستا هیچ دەقێكی زانستی سەبارەت بەم فەلسەفانە لە ئارادا نین و خوێنەری كورد لەم فێرگە فەلسەفەیی و ئایینیانەی چاین و ژاپۆن نائاگایە. دوای خوێندنەوەی ئەم كتێبەی بەڕێز دوكتۆر فیاز قەرایی، راستەوخۆ بڕیاری وەرگێڕانیم دا، ئەویش دوای وەرگرتنی رەزامەندی لە لایەن بەڕێز نووسەری ئەم كتێبەوە لە وەرگێڕانی بۆ زمانی كوردی. پێویستە ئەوەش بڵێم كتێبەكە لە سێ بەش پێكهاتووە، بەشی یەكەم فێرگەی دائۆییزم، بەشی دووەم كۆنفوشیانیزم و بەشی سێیەم بریتییە لە شینتۆییزم، كە سێ فێرگەی ئایینی و فەلسەفەیی گرنگی خۆرهەڵاتی دوورن. من سەرەتا بەشی دووەمم كرد بە كوردی، چونكە هەر بەشە و دەشێت وەكو بابەتێكی سەربەخۆ لێیبڕوانرێت، دیارە ئەمەش هەر بە رەزامەندی بەڕێز دوكتۆر فیاز قەرایی بووە، بەو هیوایەی لە ئاییندەیەكی زۆر نزیكدا دوو بەشەكەی دیكە تەواو بكەم.

هەروەها پێویستە ئەوەش بڵێم لە ساڵی ٢٠١٠ دەستم بە وەرگێڕانی ئەم كارە كرد، بەڵام بە چەند هۆیەك چاپكردنەكەی تا ئەمڕۆ دواكەوت، بۆیە لێرەوە سوپاسی

بەرێز "ئەبوبەکر ساڵح ئیسماعیل" دەکەم، کە داوای لێکردم کتێبەکەی بۆ بنێرم و بەڕێزیان لە دەزگای موکریانی بڕیارە لەم ساڵەدا چاپی بکەن، بێگومان خۆشەویستی ئەو بۆ ئەم بابەتە فیکرییەی جیهانی خۆرهەڵاتی دوور، وایکرد من جارێکی دیکە و بە وردی پێداچوونەوە بۆ ئەم کارە بکەم و زاراوە و شێوازی دارِشتنەکەی پەیوەست بە مێتۆدی ئێستای نووسینم رێکبخەمەوە.

**پێشڕەو محەمەد**
**مانگی ژانویەی ٢٠١٣**
**سلێمانی – مێلۆدی کافێ**

## نامەی وەرگێڕ بۆ نووسەری ئەم کتێبە:

**سڵاو بۆ بەڕێز دوکتۆر فیاز قەرایی**

**من (پێشڕەو محەمەد) خەڵکی کوردستانی عیراق، ماوەیەك دەبێت حەزدەکەم ئەم کتێبەی بەڕێزتان (کۆنفوشیانیزم)[1] بکەم بە کوردی، ئەگەر بەڕێزتان مۆڵەت بدەن بە گواستنەوەی ئەم کتێبە لە زمانی فارسییەوە بۆ زمانی کوردی، ئەوا ئاواتەکەم بەدیدێت، و هاوکات بۆ فێرخوازان و خوێنەرانی کوردزمان گرنگییەکی زۆری دەبێت.**

**شاد و سەرکەوتوو بن...**

**پێشڕەو محەمەد**
**کوردستانی عیراق-سلێمانی/رانیە**
**٢٨ – ١١ – ٢٠١٠**

---

١ ئەم کتێبە لە بنەڕەتدا ناوی ئایینی رۆژهەڵاتی دوورە، بەڵام من کۆنفوشیانیزمم وەرگێڕاوەتەوە و لەبەر ئەوەی خودی نووسەریش لە نێو دەقەکەدا پێیوایە کۆنفوشیانیزم ئایین نییە، بەڵکو بەئایینکراوە و خۆی زێتر جەخت لەسەر فەلسەفەیی ئەم فێرگەیە دەکاتەوە.

## وەڵامی نووسەر بۆ وەرگێڕ

سڵاو

بەڕێز کاك (پێشڕەو محەمەد) خۆشحاڵم، کە کتێبەکەم سەرەنجی ئێوەی ڕاکێشاوە، ئێوە دەتوانن کتێبەکەم وەربگێڕن بۆ زمانی کوردی، هەر کاتێك چاپتان کرد نوسخەی بۆ من بنێرن. ڕێز و سڵاوم بۆ کوردە باش و میواندۆستەکان هەیە.

برات قەرایی

زۆر سوپاس

٢٠١٠-١٢-١

"کۆنفوشیانیزم" وەکو گرنگترین فێرگە لە نێوان فێرگەکانی چاین، لە سەدەی شەشەمی بەر لە کریست، دەرکەوت. فێرگەی کۆنفوشیۆس، فێرگەیەکی کۆمەڵایەتییە و پشت بە بنەمای داب و نەریتی باووباپیران و ڕێبازی پێشینان دەبەستێت و لە بنەڕەتدا بە فێرگەیەکی ئایینی دانانرێت، هەروەها لەو فێرگەیەدا تیۆلۆژیی (یان یەزدانناسی) وەکو پرەنسیپی ئافراندن و... هتد ناخرێتەڕوو. بە گوتنێکی دیکە، بنەماکانی ئەم فێرگەیە لەسەر فێرکارییە یەزدانییەکان نەوەستاوە، بەڵکو بناغەکەی پشت بەستە بە ڕەچاوکردنی پێشینان، بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵگە. ئەگەریش لە سەرەتای شێوەگرتنی ئەم فێرگەیەدا قسە لەبارەی خوداوەند کرابێت، ئەوا وەکو خستنەڕووی پرەنسیپ و بنەڕەتێکی فێرگەکە نەبووە، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەم فێرگەیە پەیامەکەی خۆی بە زیندووکردنەوەی داب و نەریتی پێشینان زانیوە بۆ خۆشگوزەرانکردنی کۆمەڵگە و خەڵکی، ئەوا لەبارەی خوداوەندیش قسەی کردووە، ئەویش تەنها وەکو ئاماژەکردن بووە بە یەکێك لە بیروباوەڕی پێشینان. هەڵبەت ئەم فێرگەیە لە درەنگترێکدا، بە تێپەڕینی کات، ڕەنگێکی ئایینی زێتری بەخۆیەوە گرت و بووە خاوەن داب و نەریت و دروشمی ئایینی تایبەتمەند و تەنانەت چەندین پەرستگای زۆریش بۆ زیارەتکارانی ئەم فێرگەیە ئاواکران.

فێرگەی کۆنفوشیۆس لە نێوان فێرگە چاینییەکاندا زۆرترین پەیڕەوکاری هەیە و چاینییەکان بۆ ئەم فێرگەیە، وەکو پارێزەری داب و نەریتی پێشینانی خۆیان، ڕێزێکی زۆر دادەنێن. دوای سەرکەوتنی شۆڕشی کۆمیونیستی چاین لە نیوەی سەدەی بیستەمی زایینیدا، لای کۆمیونیستەکان و حکومەتەکەیان کۆنفوشیۆس نەفرەتلێکراوترین دانای

چاین و کۆنفوشیانیزم ڕەزاگرانترین فێرگەی چاینی دێرین بوو، بەم باوەڕییەی، کە کۆنفوشیۆس بە درێژایی مێژووی چاین، زەمینەی بۆ چەوساندنەوەی جەماوەری خەڵکی بەهۆی فەرمانڕەواکان خۆشکردووە و لە فێرکارییەکانیدا لە جیاتی پارێزگاریکردن لە خەڵکی، بەرگری کردووە لە چینی فەرمانڕەوای ئەریستۆکراتی و سیستەمی فیۆدالیزمی لە چایندا بەرز نرخاندووە. بەم هۆیەوە، لە کتێبی خوێندنی چاینی کۆمیونیستدا، کۆنفوشیۆس وەکو کۆنەپەرستترین کەسێتی مێژووی چاین بە خوێندکاران دەناسێندرا و لە بواری سیاسەتەکانی کۆمیونیستیشدا، بە چەندین بۆنەی جیاواز، چەندین درامای سووکایەتیئامێز بە کۆنفوشیۆس نووسران و نمایش کران.

## ١- ژیانی کۆنفوشیۆس[٢]

کۆنفوشیۆس لە ساڵی ٥٥١ی بەر لە کریست، لە ویلایەتی "لو"[٣]، شانگ های[٤] ئێستا، هاتە جیهانەوە. ناوی خێزانەکەی برێتی بوو لە "کۆنگ"[٥] و ناوە بچووکەکەیشی برێتی بوو لە "چیو"[٦]. ئەو دواتر بە "کۆنگ فو زی"[٧] واتا "داناى رێزداری کۆنگ" ناسرا و هەمان ناوونیشان بەهۆی فەرەنسییەکانی نیشتەجێی چاین لە سەدەی حەڤدەهەمی زایینیدا درا بە "کۆنفوشیۆس"، کە ئەمڕۆکەش هەر بەم ناوونیشانەوە ناسراوە.

کۆنفوشیۆس لە خێزانێکی هەژار، بەڵام رەسەن و پێشینە ئەریستۆکراتی، چاوی بە رووی جیهاندا کردەوە. لە تەمەنی سێ ساڵی کۆنفوشیۆسدا، باوکی کۆچی دوایی کرد و دایکی بوو بە بەرپرسی پەروەردەکردن و فێرکردنی. دایکی بە لەخۆبووردووییەوە، بەرگەی هەموو دژوارییەکانی گرت بۆ ئەوەی کوڕەکەی لە پەروەردە و فێرکردنێکی شایستەدا بەهرەمەند بێت.

---

2- Confucius
3- Lu
4- Shang Hai
5- Kong
6- Qiu
7- Kong Fu zi

کۆنفوشیۆس لە تەمەنی گەنجێتیدا، لە مۆسیقا و کەمانسازیدا- کە پەیوەست بوون بە هونەرە ئەریستۆکراتییەکان- لێهاتوویییەکی زۆری بەدەستهێنابوو. ئەو لە تەمەنی پازدە ساڵیدا روویکردە زانست و لەوە بەدواوە، تەواوی کاتەکانی خۆی تەرخانکرد بۆ خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە لە مێژووی چاینی دێرین و زۆر هۆگری خوێندنەوە و بەدواداچوونی مێژوو و کولتووری چاینی دێرین بوو. ئەو لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا، لەتەك کچی خێزانێکی ئەریستۆکراتیك، پرۆسەی هاوسەرگیری ئەنجامدا و دوای ساڵێك بوو بە خاوەنی منداڵ. ئەو لە تەمەنی بیست ساڵیدا، لای دەستەڵاتداری دەڤەرەکە، بە بەرپرسی کێڵگەی کشتوکاڵی هەڵبژێردرا، بەڵام سەرباری ئەمە، وازی لە خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە نەهێنا. لە تەمەنی بیست و سێ ساڵیدا، دایکی، کە زۆر رێزی دەگرت، کۆچیی دوایی کرد و دەگێڕنەوە، کە بۆ ماوەی سێ ساڵ پرسەی بۆ داناوە. درەنگترێك ئەم رەفتارە رێزئامێزەی کۆنفوشیۆس سەبارەت بە دایکی و کاریگەرییە قوڵەکەی ئەو بەهۆی لەدەستدانی، بوو بە نموونەی چاینییەکانی دیکەش[1].

کۆنفوشیۆس، کە لە تەمەنی بیست و سێ ساڵیدا، بە بەهانەی پرسەی دایکی، دوور کەوتبۆوە لە پلە و پایەی حکومەتی، دوای کۆتایی پرسەی دایکیشی، لای لە پۆستە حکومییەکەی نەکردەوە و جارێکی دیکە تەواوی کاتەکانی خۆی تەرخانکرد بۆ خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە لەبارەی مێژوو و کولتووری چاینی دێرین و لەتەکیدا خۆی خەریککرد بە وانەگوتنەوەی تایبەتی و فێرکردن و پەروەردەکردنی خوێندکارەکانی و لەو رۆژانەدا بوو، کە نازناوی "کۆنگ فو زی" پێدرا. وانە و فێرکارییەکانی ئەو بە ناوونیشانی "هونەرە شەشینەکان" برێتی بوون لە بوارەکانی: مێژوو، شیعر، داب و نەریت، دانایی، سیاسەت و مۆسیقا. لە دەڤەرەکانی دەوروبەری، خوێندکارانی زۆر هاتنە لای بۆ تێگەیشتن و زۆرینەی خوێندکارەکانی مامۆستاش، لە ئەریستۆکراتییەکان بوون. کۆنفوشیۆسی دانا، باوەڕیی وابوو، کە چاکەکاری و خۆشگوزەرانی کۆمەڵگە بەهۆی بەهرەمەندیی پەروەردەکراوەکانی فێرگەکەی ئەو دەستەبەر دەبێت و ئەگەر خوێندکارە پەروەردەکراوەکانیش لە لە

پێگەی دەستەڵات و جێبەجێکردندا بن، ئەوا کاری ماڵ و وڵات ڕێك و پێك و دەوڵەمەند دەبێت.

کۆنفوشیۆس  لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا بۆ دەزگای وەزارەت هەڵبژێردرا و تا پلەی سەرۆك وەزیر ڕۆیشتە پێشەوە. بەڵام ئەو بەهۆی قسەی بێ بنەما و ئیرەیی و چاوچنۆکی ئەوانیدی، کە لەوانەبوو سەریشی تێدا بچێت، لە نزیکەی پەنجا و چوار ساڵیدا لە وەزارەت و حکومەت دوور کەوتەوە و لەتەك هەندێك لە خوێندکارە تایبەتییەکانیدا لە ویلایەتی لو ڕۆیشتە دەرەوە و بە سەفەر و گەشتکردن بۆ دەوروبەر خەریك بوو. ئامانجی ئەو لەو گەشتانەی، بانگەشەکردنی فێرکارییەکانی خۆی و زەمینەسازی بوو بۆ ئەنجامدانی ریفۆرمی کۆمەڵایەتی و سیاسیی، بۆ ئەوەی لە ژێر سایەی ئەوەدا، خەڵکی لە ئاییندەدا لە ئاشتی و ئارامیدا بژین. بەڵام سەفەرەکانی هێندە سەرکەوتوو نەبوون و نەتەنها هەر پێشوازی لێنەکرا، بەڵکو چەندین جار دووچاری ئازاردانیش هاتووە. بەهۆی ئەوەی کۆنفوشیۆس کەسێتییەکی پابەند بە داب و نەریت و مۆراڵی کۆمەڵایەتی بوو، و ئەم کارەی لەتەك دیکتاتۆریی دەستەڵاتداراندا نەگونجاو بوو، بۆیە دەستەلاتدارانیش ئەویان ڕەتدەکردەوە. سەربارەی ئەوەی، ئەم لە فێرکارییەکانیدا جەختی لەسەر ڕێزگرتن و گوێڕایەڵی دەستەڵاتداران دەکردەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی فێرکارییەکی لە بنەڕەتدا نەگونجاو بوون لەتەك دیسپۆتیزمدا (استبداد)، بۆیە دەستەڵاتدارانیش خۆیان پاراست لە هاوکاریکردن و پێشوازی لێکردنی. تەنانەت ئەو لە یەکێك لە شارەکاندا، خرایە نێو زیندانەوە و لە شارێکی دیکەشدا خەڵکی بەهۆی تێنەگەیشتن لێی، دژی ئەو هەستان و کۆنفوشیۆس بەپێی پەتی ناچار بوو رابکات و سەرباری ئەوەی یەکێك لە سەربازان، ئەوی خستە ژێر چاودێرییەوە، بەڵام نەیتوانی دەستگیری بکات.

سەرەنجام، کۆنفوشیۆس دوای سێزدە ساڵ لە گەشت و سەفەر، لە تەمەنی شەست و حەوت ساڵیدا بەهۆی یەکێك لە خوێندکارەکانییەوە، لە لایەن حاکمی ویلایەتی لو، بە ڕێزلێگرتنێکی زۆرەوە، بانگهێشتی ئەو ویلایەتە کرایەوە. ئەو ئەم بانگهێشتەی پەسەندکرد و گەڕایەوە بۆ نیشتیمانەکەی خۆی. لەوە بەدوا، کۆنفوشیۆس بەگوێرەی ئەو

ئاشتییەی دەیبینی، دەستیکرد بە لێکۆڵینەوە و فێرکردن و پەروەردەکردنی خوێندکارەکانی، هەرچەندە هەندێکجاریش دەستەڵاتدار(حاکم) راوێژی پێدەکرد. سەرەنجام کۆنفوشیۆس دوای نزیکەی چوار ساڵ لە لێکۆڵینەوە و فێرکردن و پەروەردەوە، لە تەمەنی حەفتا و دوو ساڵی (٤٧٩ی بەر لە کریست)، لە کاتێکدا، کە بێهیوا بوو لە بەدەرەنجام گەیشتنی فێرکارییەکانی، چاوی بە رووی جیهان داخست و خوێندکارەکانی بۆ ماوەی سێ ساڵ پرسەیان بۆ دانا. ئەو چەندین خوێندکاری کارامەی لە دوای خۆی بەجێهێشتن، کە بوونە درێژەپێدەری رێگەی مامۆستاکەیان و پەرەیان بە فێرکارییەکانی ئەو دا. بەهۆی هەوڵ و کۆششی خوێندکارەکانییەوە، کۆنفوشیۆس هێدی هێدی ناووبانگی "مامۆستای مەزنی چاین"ی وەرگرت و لە سەدەی دووەمی بەر لە کریست، گۆڕا بۆ خاقانی[٨] بێ تاج و تەخت، کە سەروەر بوو بەسەر خاقانەکاندا.

کۆنفوشیۆس لەبارەی رەوتی ناوەکی (معنوی) خۆی وەها دەبێژێت: "من لە پازدە ساڵیدا خۆم تەرخانکرد کرد بۆ فێربوون [کە مەبەست لەو فێربوونە دائۆیە]، لە سی ساڵیدا جێگیر بووم [کە مەبەست لەوە پەیبردن بە "لی" و لە دەرەنجامدا، نواندنی رەفتاری شایستەیە]، لە تەمەنی چل ساڵیدا لە گومان و ڕاڕایی ئازاد بووم [کە مەبەست لەوە هەبوونی تایبەتمەندیی داناییەکە، و بە دەربڕینێکی دیکە، گەیشتنە بە دانایی پەتی]، لە پەنجا ساڵیدا لە ویستی ئاسمان تێگەیشتم [کە مەبەست لەوە تێگەیشتنی تەواوە لە حوکمی ئاسمان یان "مینگ"]، لە تەمەنی شەست ساڵیدا گوێڕایەڵی بووم [کە مەبەست لەوە پەسەندکردنی ویستی ئاسمانە لە کرداردا و خۆبەدەستەوەدان لەبەرانبەریدا]، لە هەفتا ساڵیدا توانیم بەدوای ئارەزووەکانم بکەوم بێ ئەوەی لە سنووری راستی دەربچم [کە مەبەست لەوە شوێنکەوتنی بێ ناچارییانەی مەبەستی داناییانە و خاوەن شاهینەیەکی راستکاری]". (پەیڤینەکان، بەشی ٢، ٤)

---

٨ - خاقان ئەو نازناوە بوو، کە ئیرانییەکان بە پاشاکانی چاین و تورکستانیان دابوو، واژەکە لە بنەڕەتدا تورکییە. (وەرگێڕ)

## ٢- دەقە کۆنفوشیۆسییەکان

دەقەکانی کۆنفوشیۆسی بە شێوەیەکی گشتی بۆ دوو گروپ دابەش دەبن: کتێبە دێرینەکان (جینگەکان) و کتێبە چوارینەییەکان (سی شو).

### ٢-١ کتێبە دێرینەکان یان جینگەکان[٩]

**کتێبە کۆنە شەشینەکان**

کتێبە دێرینەکان (دەقە کلاسیکییەکان)ی کۆنفوشیۆسی یان جینگەکان، پێشیان دەگوترێت هونەرە شەشینەکان (زانستە مرۆییە شەشینەکان) یا لیو یی[١٠]. بەشێکی سەرەکی ئەم کتێبانە بەهۆی کۆنفوشیۆس کۆکراونەتەوە و بەشێکی لاوەکیش بە قەڵەمی خۆی نووسراون. کتێبە دێرنەکانی کۆنفوشیۆسی[(٢)] برێتین لە:

١- **شو جینگ**[١١] یان **کتێبی مێژوو**: ئەم کتێبە، کە گرنگترین بەرهەمە لەبارەی مێژوو و هزری سیاسیی چاینی دێرین، هەڵگری سەد بەڵگەیە لە زنجیرە دێرینەکان، کە لە سەدەی بیست و چوارەمی بەر لە کریست تا سەدەی هەشتەمی بەر لە کریست دەستەڵاتدار بوون. لە بەشێکی سەرەکی بابەتەکانیدا، چەندین گفتوگۆ ئەنجام دراون لە نێوان میران و وەزیران لەبارەی کێشەکانی وڵات، پرۆگرامە نەتەوەییەکان،

---

9 -Jings

10 -Liu Yi

11 -Shu Jing

سوێندخواردنەکانی بەر لە چوونە نێو جەنگ و شێوازی جێبەجێکردنی کولتەکانی پێشوازیکردن. بەشێکی لاوەکیشی، تەرخانکراوە بۆ چەندین داستان لەبارەی کەسێتییە گرنگەکانی زنجیرە دێرینەکان. ئەمڕۆکە تەنها بیست و چوار بەڵگە لە سەد بەڵگەکان ماونەتەوە.

٢- **شی جینگ**[١٢] یان **کتێبی شیعر**: ئەم کتێبە ٣٠٥ فراگمێنتی هەڵبژاردووە لە نێوان زێتر لە ٣٠٠٠ فراگمێنتی شیعری باوی خەڵکی لە قۆناغی پێنج سەد ساڵەی چایندا (لە نێوان سەدەی دوازدەیەمی بەر لە کریست تا نزیکەی سەدەی حەوتەمی بەر لە کریست). ئەم شیعرانە لەژێر چوار ناوونیشان پۆلێنبەند کراون:

یەکەم: "شیعرەکان لەبارەی ژن و مێرد".

دووەم: "چەندین شیعری نزم نەریتی" بۆ جەژنە گشتییەکان.

سێیەم: "چەندین شیعری بڵند نەریتی" بۆ جەژنە دەوڵەتییەکان.

چوارەم: "شیعرەکانی پەیوەست قوربانی" بۆ سەماکردن لە پەرستگاکان و نمایشی گشتی.

کۆنفوشیۆس باوەڕیی وابوو، کە شعیر زۆر سوودمەندە بۆ گواستنەوەی فێرکارییەکان و ناوەرۆکەکان و خوێندنەوەیان سەرباری ئیلهامبەخشین و هێشیداربوون، ئەوا هاریکاریشە بۆ کۆمەڵایەتیبوونی مرۆڤ.

٣- **یی جینگ**[١٣] یان **کتێبی گۆڕانەکان**: ئەم کتێبە، کە بە کتێبێکی فەلسەفەیی فێرگەی کۆنفوشیۆس ئەژمار دەکرێت، هەڵگری جۆرێکە لە کۆسمۆلۆژیی (گەردووناسی) لەسەر بنەمای سیمبولیی بە ناوی "باگوا"[١٤] یان "هەشت سێهێڵی"، کە بە یادهێنەرەوەی لێهزرینی چاینی دێرین (نزیکەی سێ هەزار ساڵ بەر لە کریست) دادەنرێت. داناکانی چاینی دێرین لە ڕێگەی هەمان ئەم "سێهێڵی"یانەوە، زانیارییان لەبارەی نهێنییەکانی جیهان نیشان دەدا و هەوڵیان دەدا بەڕێی خۆشبەختی و

12 -Shi Jing

13 -Yi Jing

14 -Bagua

خۆشگوزەرانییەوە، نیشانی خەڵکی بدەن و ئەوان لە بەدبەختی دوور بخەنەوە. ئەم "هەشت سێهێڵی"یە، پێکهاتەیەکی هەشتینەیە لە هێڵێکی بەردەوام و هێڵێکی دابڕاو، کە یەکێك لەم دوو هێڵە لە یەکێك لە پێکهاتەکاندا دووبارە دەبێتەوە. بەپێی کتێبی گۆڕانەکان، جیهان لە "یانگ و یین" پێکهاتووە و هێڵی بەردەوام نوێنەری "یانگ" و هێڵی دابڕاو نوێنەری "یین"ــە. ئەم دووانە، هێزە دووانەییەکانی سروشتن و یانگ نێر و یین ئەستوو[15]ــە. "یانگ" لە ئاسمان، خۆر، ڕۆشنایی و ژیاندا، و "یین" لە زەوی، مانگ، تاریکی و مەرگدا، خۆی نمایش دەکاتەوە. لەبەر ئەوەی شرۆڤەکردنی تەواوی فێنۆمێنەکانی جیهان بەم دوو هێڵە شیاو نەبوو، دانا چاینییەکان ئەم دوو هێڵەیان لەتەك چەند ڕێکخستنێکی تایبەتیدا بۆ هەشت سێهێڵی زیاد کرد، کە هەر یەك لەوانە، سیمبولی یەکێك لە فێنۆمێنە گرنگەکانی سروشت بوو، وەکو: ئاسمان، زەوی، هەورەگرمە، ئاو، کێو، با، ئاگر و گەناو[16]. پاشان کۆنفوشیۆس ئەم "هەشت سێهێڵی"ییەی تاسەر ئاستی "شەست و چوار شەشهێڵی" بەرەوپێشەوە برد.

٤- **لی جی**[17] یان **کتێبی داب و نەریتەکان:** ئەم کتێبە تەرخانکراوە بۆ داب و نەریت و کولتەکانی خەڵکی چاینی دێرین. کۆنفوشیۆس زۆر جەختی دەکردەوە لەسەر پاراستنی داب و نەریتی پێشینان-بەگشتی داب و نەریتی ئایینی و داب و نەریتی کۆمەڵایەتی-. ئەو بەپێی زەرووەتی پاراستنی داب و نەریتەکانی چاینی دێرین، بە سەرنجدانی ئەو کتێبانەی لەم بوارەدا لە ئارادا بوون، ئەم کتێبەی کۆکردەوە. کۆنفوشیۆس دەیگوت بەبێ لێکۆڵینەوەی داب و نەریتی پێشینان، مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت پێگەیەکی پتەو بۆ خۆی دەستەبەر بکات.

٥- **چون چیو**[18] یان **ساڵنامەی بەهار و پاییز:** ئەم کتێبە چەندین ڕووداوی گرنگی ویلایەتی لوی لەخۆگرتووە، لە کۆتاییەکانی سەدەی هەشتەمی بەر لە کریست تا

---

15- Matter

16- Swampland یان زەلکاو

17 -Li Ji

18 -Chun Qiu

سەرەتاکانی سەدەی پێنجەمی بەر لە کریست. ئەم بەرهەمە وەکو یاداشتێکی رۆژانەیە، کە رووداوە گرنگەکانی بە ریزبەندییەکی مێژوویی تێدا جێگیر کراوە. تایبەتمەندی گرنگی ئەم کتێبە، ئەوەیە، کە کۆنفوشیۆس هەوڵدەدات گێڕانەوەی رووداوە خۆش و ناخۆشەکان، بەبێ چاوپۆشیکردن لە حەقیقەت، بخاتەڕوو بۆ ئەوەی ببێتە پەندێك بۆ ئەوانی دیکە. لەبەر ئەوەی گێڕانەوەکانی ئەم کتێبە لەبارەی رووداوە سیاسییەکانی ویلایەتی لو و سەربوردەی دەستەڵاتدارەکانیی هاتۆتە ئاخافتن، ئەوا بە "سیاسەتنامەی چاین"یش ناسراوە.

٦- **یائۆ**[19] یان **مۆسیقا:** کۆنفوشیۆس دوای ئەوەی هەڵبژاردەی شیعرە دێرینەکانی تەواوکرد، ئەوا بڕیاریدا بۆ هەر یەکێك لە فراگمێنتە شیعرییەکان، پارچەیەك ئاوازی شیاویشیان بۆ دابنێت. لەم رووەوە، ئەو لە هەر شوێنێك، کە بە شیاوی زانیبا، ئاوازێکی لە ئاوازە دێرینەکان نوێدەکردەوە و ئەگەر ئاوازێکی شیاوی نەدۆزیبایەوە، ئەوا بۆ خۆی ئاوازێکی دادەنا. کۆنفوشیۆس باوەڕێکی قوڵی بە بەرهەمی مۆراڵی مۆسیقی هەبوو و دەیگوت مۆسیقا دەتوانێت هەستەکانی مرۆڤ جوان و رێکبخات و دووری بخاتەوە لە نارێکوپێکی کۆمەڵایەتی. هەڵبەت ئەو جەختی لەسەر برەوپێدانی مۆسیقای پەتی (یان ساخ) دەکردەوە و بانگەشەی یاساغکردنی مۆسیقای ناساخی دەکرد. شیاوی بیرهێنانەوەیە، کە کتێبی مۆسیقا، ئەمڕۆکە وەکو دەقێکی سەربەخۆ و جیاواز نایەتە ئەژمار و لە نێو پێنج کتێبی دێرینی دیکەدا ریزبەندکراوە و لەم رووەوەیە، کە ئەمڕۆکە کتێبە دێرینەکان، وەکو کتێبە دێرینە پێنجینەکان باس دەکرێن.

لە نێوان ئەم کتێبانەی باسکران، ساڵنامەی بەهار و پاییز، داهێنراو و نووسراوەی خودی کۆنفوشیۆسە و ئەوانیدیکە بەهۆی ئەوەوە کۆکراونەتەوە، هەروەها خۆیشی خاکەڕاییانە دان بەوەدا دەنێت، کە بابەت و بەرهەمی داناکانی پێشووی کۆکردۆتەوە و گواستوویەتییەوە. سەرباری ئەمە، گەرەکە بگوترێت کۆنفوشیۆس جگە لە گواستنەوەی

---

19 -Yao

ئەم بابەتانە، ئەوانەی بە هەڵبژاردنێکی داناییانە رێکخستووە و بۆ داهاتووانی گواستۆتەوە.

## ٢-٢ کتێبە چوارینەییەکان یان سی شو[٢٠]

ئەم کتێبانە وەکو دەقەکان هەڵگری فێرکارییەکانی کۆنفوشیۆسی دانان، بەهۆی خوێندکارەکانییەوە نووسراونەتەوە. خوێندکارەکانی کۆنفوشیۆسی دانا لە کاتی ئامادەبوونیان لە وانەی مامۆستاکەیان، باوەڕیی و تێڕوانینە کەسییەکانی ئەویان لە نێو وانەی دەقە دێرینەکان، بە جیاواز تۆمار کردووە. کۆی ئەم یاداشتانە، کە دوای مەرگی مامۆستا، لە ژێر ناوونیشانی سی شو یان کتێبە چوارینەییەکان کۆکراونەتەوە(٣) برێتین لە:

١- **لون یو**[٢١] یان **گوتەکان:** ئەم کتێبە هەڵبژاردەیەکە لە گوتەکان و فێرکارییەکانی کۆنفوشیۆس و ناوەرۆك و پوختەی لێهزرینەکانی ئەوە.

٢- **جۆنگ یۆنگ**[٢٢] یان **رێبازی میانەڕەوی:** ئەم کتێبە برێتییە لە بنەما فەلسەفەییەکانی کۆنفوشیۆس و لەبارەی هەماهەنگی مرۆڤ لەتەك جیهانی ناوەکی و جیهانی دەرەکیدا دەکەوێتە خەریکگەرییەوە. وا زانراوە ئەم کتێبە برێتیی بێت لە دوو بەش، کە بەشی یەکەم و پێشووتری بەهۆی نەوەی کۆنفوشیۆس و بەشی دووەم و کۆتاییەکەی لە نزیکەی سەدەی دووەمی بەر لە کریست، بەهۆی خوێندکارانی فێرگەی کۆنفوشیۆس، نووسراوەتەوە. ئەم کتێبە لە بنەڕەتدا، بەشی بیست و هەشتەمی کتێبی داب و نەریتەکان (لی جی) بووە.

---

20 -Si Shu

21-Lun Yu

22- Zhong Yong

٣- **دا سوئە**[٢٣] یان **فێرکاری مەزن:** ئەم کتێبە، تەرخانکراوە بۆ پەروەردە و فێرکردن و داب و نەریت و رەفتارنوێنی کۆمەڵایەتی فێری خەڵکی دەکات. ئەم نامیلکەیە لە بنەڕەتدا، بەشی سی و نۆیەمی کتێبی داب و نەریتەکان (لی جی) بووە.

٤- **مێنگ زی** (Meng Zi) یان **مێنیسیوس** (Mencius): ئەم کتێبە لە سەدەی سێیەمی بەر لە کریست بەهۆی مێنیسیوسی دانا (مەزنترین راڤەکاری لێهزرینەکانی کۆنفوشیۆس) نووسراوەتەوە و راستییەکەی برێتییە لە راڤەکردن و لێکدانەوەی فێرکارییەکانی کۆنفوشیۆسی بە شێوەیەکی رێکخراو.

کتێبە دێرینەکان و کتێبە چوارینەییەکان، رێگەیەکی پڕ لە هەوراز و نشێویان لە رەوتی مێژوودا هەبووە و دووچاری گۆڕانپێدانێکی زۆر هاتوون. کاتێك "چێنگ" (Cheng) لە ساڵی ٢٢١ی بەر لە کریست، سەرتاسەری وڵاتی چاینی داگیر کرد، نازناوی خاقانی مەزنی چاینی بەخۆی دا. ئەو دوای ئەوەی سیستەمی فیۆدالیزمی لەنێو برد، چەندین چاکسازی گرنگی ئەنجام دان، بۆ نموونە، ئەلفابێتی چاینی ئاسانتر کرد و نووسینێکی نوێی داهێنا. هەر ئەو بوو دیواری چاینی ئاواکرد. ئەو لە کاتی ئەنجامدانی چاکسازییەکانیدا، بینی نموونەی نەیاری سەرسەختی هەنگاوەکانی، پێڕەوانی فێرگەی کۆنفوشیۆسن، لەم رووەوە، لە ساڵی ٢١٣ی بەر لە کریست، فەرمانی دا تەواوی کتێبە دێرینەکان- جگە لە دەقە پزیشکی و کشتوکاڵییەکان- بسووتێنرێن. ئەو لەم کارەیدا، ئەوەندە پێداگر بوو، ئەگەر شاراوەکاری دەقە دێرینەکانی ناسیبا، ئەوا بە سەختی ئەشکەنجە دەدران و بە ئاسنی گەرمکراو داخ دەکران و بۆ ماوەی چوار ساڵ بە بێگاری لە ئاواکردنی دیواری چایندا کاریان پێدەکرا. بەم هۆیەوە، تەنانەت ژمارەیەك لە دانا کۆنفوشیۆسییەکان بە تۆمەتی خیانەت، زیندە بەچاڵ کران.

سێ ساڵ دوای فەرمانی سووتاندنی کتێبەکان، خاقانی ناوبراو کۆچی دوایی کرد و دژایەتیکردن و کینە بەرانبەر بە بەرهەمە دێرینەکانیش کۆتایی پێهات. دوای مەرگی ئەو، لەبەر ئەوەی کتێبخانەیەکی تایبەتیی حکومی لە سووتان پارێزراو بوو، کتێبە

23- Da Xue

دێرینەکانی کۆنفوشیۆسیش، کە بە ساخی مابوونەوە، دووبارە برەویان پەیداکردەوە و زێتر لە پێشوو ناسران و رێزێکی زۆریان بۆ کۆنفوشیۆس زیاد کرد.

بەڵام بە داخەوە ئەم کتێبانە دوای برەو پەیداکردنی دووبارە، لە کاتی دەرەنجامگیریدا دووچاری گۆڕانپێدان و لادانێکی زۆر هاتن و لێکدانەوەی راڤەکاران و تێڕوانینی رەتکەرەوەکانیش بۆ دەقە سەرەکییەکە زیاد کراو لەتەکیدا تێکەڵ کران. لە هەمان قۆناغی دەرەنجامگیری کتێبەکاندا بوو، کە تەنانەت کەسێتییەکی خوداوەندی بە کۆنفوشیۆس درا و چەندین دیناو (کشف) و بەخشندەیی (کرامات)ی بۆ سازکرا. سەرەنجام ئەم گۆڕانپێدان و لادانانە، دوو گروپی لە نێوان پێڕەوانی فێرگەی کۆنفوشیۆسی هێنایە ئارا، کە ژمارەیەك لایەنگیری دەقە دێرینەکانیان دەکرد و ژمارەیەکی دیکەیش بەرگریان لە دەقە نوێیەکان دەکرد. ئەم تەنگژەیەی نێوان لایەنگرانی فێرگەی کۆنفوشیۆس، نزیکەی دوو هەزار ساڵ درێژەی کێشا تا ئەمەی لەسەر بە سەختیگرتنی جیاوازییەکان و کێشەوبەرەکان لە نزیکەی سەدەکانی هەژدەیەم و نۆزدەیەمی زایینیدا، بە لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنێکی فراوان، دەقە سەرەکییەکان لە لادان و زیادکردنەکان پاك کرانەوە و تەنگژەکانیش کۆتاییان هات(٤).

## ٣-   فێركارییەكانی كۆنفوشیۆس

**فێركارییەكانی كۆنفوشیۆس بەم ناوونیشانانەوە، لێیان دەتوێژرێتەوە:**

### ٣-١ ئۆنتۆلۆژیی (بوونناسی)

دەتوانین پرەنسیپە گشتییەكانی ئۆنتۆلۆجیی كۆنفوشیۆس بەم جۆرە پوخت بكەینەوە:

- **تیان**[٢٤] یان **ئاسمان**: كۆنفوشیۆس چەندین جار لەبارەی هێزێكی پیرۆز و سەروەر بەسەر جیهاندا دێتە ئاخافتن، ئەم هێزەش بەدیدی ئەو، مەبەستدار، فەرمانڕەوای تەواوی جیهان، بەدیهێنەری تەواوی بوونەوەران و چاودێرە بەسەر كردارنوێنی مرۆڤەكاندا و جیهان بە ویستی ئەو بەڕێوە دەچێت و ویستی ئەو، یاسای سەروەرە بەسەر جیهاندا و هاوكات ڕێسای بوونیشە. كۆنفوشیۆس ئەم هێزە باڵایە ناو دەنێت "تیان" یان "ئاسمان" و وەكو "خودا" باسی دەكات، كە هەڵبەت ئەم خودایە ناكەسیی و نادیارە. لە فێرگەكەی ئەودا، هەرچەند باوەڕبوون بەم خودایە و پەرستنی، پایەیەكی باشی هەیە، بەڵام ئامانجی ئەو زێتر ئەمەیە، كە مۆراڵیتی و فەزیلەتە مرۆییەكان لەسەر ئەم جۆرە باوەڕییە، پتەو بكات و لەوەدا پەناگەیەك بۆ مرۆڤ، لە ڕەوتكردنیدا ڕووەو چاكەكان و فەزیلەتەكان، چێبكات.

---

24 -Tian

شیاوی بەیادهێنانەوەیە، کە بەر لە کۆنفوشیۆس، خودایەکی دیار و دیاریکراو دەپەرەسترا، کە پێی دەگۆترا "دی"[25] (زەوی، خودا) و یان "شانگ دی"[26] (خودای سەروەر) و لە کۆمەڵی مرۆییدا وێنا دەکرا. بەڵام کۆنفوشیۆس لە جیاتی ئەوە، سوودی لە ناوونیشانی "تیان" (ئاسمان، خودا) وەرگرت[(5)].

- **مینگ**[27] یان **حوکمی ئاسمان:** کۆنفوشیۆس ویستی ئاسمان، کە سەروەرە بەسەر جیهاندا و رێساکانی بوونەوەران دیاریدەکات، ناودەنێت "مینگ". بە تێڕوانینی کۆنفوشیۆس "مینگ"، خواستی یەزدانییە، کە چارەنووسی مرۆڤ دیاریدەکات. ئەو باوەڕیی وایە ئاسمان خاوەن هەستێکی مۆراڵی باڵایە و کردار و لێهزرینەکانی مرۆڤ ئاراستە دەکات، سەرەنجام مرۆڤیش دەبێت بەگوێرەی ویستی ئاسمان (مینگ) ژیان بگوزەرێنێت. بەپێی تێڕوانینی ئەو، ویستی ئاسمان لە پێکهاتەی مرۆڤدا، خۆی بە روون و ئاشکرایی دەردەخات و ئەگەر مرۆڤیش بەگوێرەی پێکهاتە مرۆییەکەی رەفتار بنوێنێت، ئەوا بەگوێرەی ویستی ئاسمان و سەرەنجام مۆراڵیانە رەفتاری نواندووە. کەواتە، بۆ گونجان لەتەك ئاسمان، تەنها گەرەکە مرۆڤ بیت و بەس.

کۆنفوشیۆس باوەڕیی وابوو: "ئەوەی ئاسمان بۆ مرۆڤی شیاو کردووە، سروشتە و پێڕەویکردن لە سروشت، پێی دەگۆترێت دائۆ. وەرگۆڕینی دائۆ، فێرکردن (پەروەردەکردن)ە." (رێبازی میانەڕەوی، بەشی ١،١). بەگوێرەی ئەم تێڕوانینە، ئاسمان حەز بە خۆشگوزەرانی مرۆڤ دەکات و رێگەی گەیشتن بە خۆشگوزەرانی لە سروشتی مرۆڤدا بە ئەمانەت دانراوە، ئەگەرچی بە گشتی ئەم رێیە لەسەر مرۆڤ داخراوە، بە گوتنێکی دیکە، ویستی ئاسمان بۆ گەڕانی مرۆڤ، ئەو رێنوێنی دەکات، هەرچەندیش بە گشتی ئەم کارە بەسەر مرۆڤدا داخراوە.

---

25-Di

26 -Shang Di

27- Ming

کۆنفوشیۆس دەبێژێت: "ئەگەر ئاسمان گەرەکی بێت نەریتی فێرکاری من لەنێو بەرێت، ئەوا لەنێوی دەبات. ئەگەر ئاسمان گەرەکی بێت نەریتی فێرکاری من بە پایەداری بهێڵێتەوە، ئەوا دەیهێڵێتەوە". (گوتارەکان، بەشی ٥،٩). کۆنفوشیۆس خۆی لەپراکتیکیشدا بەمجۆرە بوو و هەمیشە لە هەوڵدا بوو ئەوەی شایستەیە ئەنجامی بدات و پاشان بە "مینگ"ی بسپێرێت. لەم رووەوە، ئەو لەتەك ئەوەی هیوایەکی زۆری بە بەئاکام گەیاندنی فێرکارییەکانی خۆی نەبوو، بەڵام لە برەوپێدانیدا کەمتەرخەمی نەدەکرد. ئەو باوەڕی وابوو باشترین کار ئەوەیە لە ئەنجامی شتێکدا هەوڵ بدەین، کە خۆمان بەپێویستی بزانین ئەنجامی بدەین، بێ ئەوەی سەرنج بخەینە سەر دەرەنجامەکەی. ئەو باوەڕی وابوو ئەمجۆرە کارکردنە هەمان "ناسینی مینگ"ـە و دەیگوت: "بێ ناسینی مینگ، ناتوانین ببینە مرۆڤێکی دانا". (گوتارەکان، بەشی ٣،٢٠).

کەواتە، ناسینی "مینگ" بە واتای ناسینی ناچارەکییانەی پرۆسەی کاری جیهان- بەمجۆرەیە- دێت. سەرەنجام، ناسینی ئەو بە واتای لەبەرچاونەگرتنی سەرکەوتن یان نشووستهێنانی رواڵەتییانەیە، کە روودەدات. ئەو مرۆڤەی بەم جۆرە بکارێت لە روانگەیەکەوە نشوست ناهێنێت. لەبەر ئەوەی ئەگەر مرۆڤ کارێك لە بنەڕەتدا بۆ ئەنجامدانی ئەرك-بەبێ سەرنجدان بە سەرکەوتن یان نشووستهێنان- ئەنجام بدات، ئەوا هەمان سەرکەوتنی مۆراڵی ئەنجام داوە. سەرەنجام، ئەم مرۆڤە لە راڕایی شکست یان سەرکەوتن رزگاری دەبێت و بەمجۆرە هەمیشە خۆشحاڵ دەبێت(٦). بەم هۆیەوە بوو کۆنفوشیۆس دەیگوت: "داناکان پەشێو نین، خۆپارێزان نیگەرانیان نییە، دلێران ترسیان نییە". (گوتارەکان، بەشی ٢٨،٩). هەروەها دەیگوت: "مرۆڤی مەزن هەمیشە شادمانە، بەڵام مرۆڤی بچووك هەمیشە نیگەرانە". (گوتارەکان، ٣٦،٧).

- **دائۆ**[٢٨] یان **رێ**: دائۆ لە زماندا، بە واتای رێ و شەقام دێت و دائۆ لە زاراوەی کۆنفوشیۆسیدا (بەو بارە مۆراڵییەی هەیەتی) دوو بەشە: رێی ئاسمان و رێی مرۆڤ.

---

28 –Dao

**ڕێگەی ئاسمان**، "تیان دائۆ"[29]ی پێدەگوترێت و مەبەست لێی ویستی ئاسمان بۆ مرۆڤ و شێوەی ڕەفتارنوێنی ئاسمانە لەتەك مرۆڤدا. ئەم ڕێگەیە بە گشتی داخراو و نهێنیئامێزە و بە ئاسانی شیاوی تێگەیشتن نییە، بۆ نموونە، هەندێکجار ئاسمان سەبارەت مرۆڤ، ڕەوایەتی بە دەرد و ئازار دەدات.

**ڕێگەی مرۆڤ**، "ژێن دائۆ"[30]ی پێدەگوترێت و بە گشتی مەبەستی کۆنفوشیۆس لە "ڕێگە"، هەمان "ڕێی مرۆڤ"ــە. ئەم ڕێگەیە، ڕێگەیەکە، کە لە لایەن ئاسمانەوە دانراوە و مرۆڤ دەبێ پێیدا ڕەتببێت. هەڵبەت لەبەر ئەوەی ئاسمان ئەم ڕێگەیەی داناوە، خۆیشی پێکهاتە و تایبەتمەندییەکی بە مرۆڤ بەخشیوە بۆ ئەوەی بە هاوکاری ئەوەوە بتوانێت بە هەبوونی ڕەفتارنوێنی باش لە ژیاندا، ئەم ڕێگەیە ببڕێت. ئەم ڕێگەیە (ڕێگەی مرۆڤ) تا ئاستێك بالاترە لە ڕێگەی مۆراڵی بە واتا باوەکەی و پێوانی ڕێگایەکە بەستراوەتەوە بە ڕەچاوکردنی ئەرکە مۆراڵییەکان. "ڕێگەی مرۆڤ" ڕێی ژیانە، هەڵبەت ئەم ڕێگەیە، ڕێگەیەکە، کە تەنها هەڵبژاردەکان و ئیلیتەکان دەتوانن پێیدا ڕەتبن.

دائۆ لە ڕوانگەیەکەوە برێتییە لە ناوەرۆکی لێهزرینەکانی کۆنفوشیۆس. دائۆ نەتەنها شێوازی ژیانی تاك دیاریدەکات، بەڵکو شێوازی ڕەفتارنوێنی و ژیانی کۆمەڵایەتیش نیشانی مرۆڤ دەدات. دائۆ ئەو ڕێگەیەیە، کە شێوازی ژیانی هەر کەسێك-لە هەر چینێکدا بێت- نیشانی دەدات. کەواتە بە شێوەیەکی پوخت، ڕاستییەکەی دائۆ هەم "ڕێگەی مرۆڤ" و هەم "ڕێگەی ئاسمان"ــە، و ئەم دووانەش لە یەکتری جیاناکرێنەوە. لەبەر ئەوەی مرۆڤ لە "ڕێگەی مرۆڤ"ــەوە، کە ڕێگەی ژیانە، دەتوانێت لەتەك ئاسماندا پەیوەست ببێت. بە دەربڕینێکی دیکە، "ڕێگەی ئاسمان" بە نێو "ڕێگەی مرۆڤ"دا تێپەڕ دەبێت و هەر کەسێك "ڕێگەی مرۆڤ" بەباشی ببڕێت، ئەوا ڕێگەی ئاسمانی بڕیوە و بە ئاسمان گەیشتووە. بە دەربڕینێك، دائۆی کۆنفوشیۆس، هەمان ڕێگەی پێکهاتن و جەوهەری مرۆڤە.

---

29- Tian Dao

30 -Ren Dao

به تێڕوانینی کۆنفوشیۆس دائۆ شتێکە وەکو لەپی دەستە و ئەمە مرۆڤە، کە دەتوانێت ڕێگایەکە ببڕێت و نەك ئەوەی ڕێگایەکە بتوانێت مرۆڤ خۆشڕەو بکات. بە گوتنێکی دیکە، مرۆڤ بەرپرسی ڕەفتارنواندن و کردارنواندنەکانی خۆیەتی(٧). "ئەمە دائۆ نییە مرۆڤ دیاریدەکات [و مەزنێتی پێدەبەخشێت]، بەڵکو ئەمە مرۆڤە، کە دائۆ دیاریدەکات [و مەزنێتی پێدەبەخشێت])). (گوتارەکان، ١٥،٢٨).

- **یانگ و یین"**[٣١] یان **پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ:** "یانگ و یین" دوو هێزی سەرەکی جیهانن، کە بە زەرووری، هەر فێنۆمێنێك لە نێو خودی ئەم دوو هێزەدا هەیە. ئەم دوو هێزە دژی یەکترین و مانەوەی هەر فێنۆمێنێك پەیوەستە بە مانەوەی هەردوو هێزەکە. ئەم دوو هێزە "یانگ و یین"، بە گوێرەی نوێنەری بزووتن و نەبزووتن، گەرم و سارد، ڕەق و نەرم، نێر و مێ، ڕۆژ و شەو، ئاسمان و زەوی و بکەر و بەرکار و...ن.

## ٢-٣ مرۆڤی دانا

بە تێڕوانینی کۆنفوشیۆس، مرۆڤ بە هەر ئەندازەیەك لە "هە"[٣٢] یان "هەماهەنگی" و گونجاوی بەهرەمەند بێت، ئەوا بە هەمان ئەندازەش ڕێگەی مرۆڤی دانای گرتووەتەبەر. هەڵبەت هەماهەنگی (یان گونجان)ی مرۆڤ خاوەن دوو ڕەهەندە: "هەماهەنگی تاك" و "هەماهەنگی کۆمەڵایەتی".

مەبەست لە **هەماهەنگی تاك** بریتییە لەوەی مرۆڤ بەگوێرەی پێکهاتە و جەوهەری خۆی کار بکات، بەم واتایە، کە بە تەواوی مرۆییانە هەڵسوکەوت بکات و تەواو مرۆڤ بێت. مرۆڤ بە هەر ئەندازەیەك ئەگەر لەم ڕێگەیەدا سەرکەوتوو بێت، ئەوا بە هەمان ئەندازەش لەتەك "ئاسمان"دا هەماهەنگ دەبێت و سەرەنجام لەتەك بوونەوەرانی دیکە و تەواوی جیهانی بوون بە هەماهەنگی دەگات.

---

31 -Yang & Yin
32- he

مەبەست لە **هەماهەنگی کۆمەڵایەتی** بریتییە لەوەی مرۆڤ پەیوەندییەکی باشی لەتەك تاکەکانی دیکەی کۆمەڵگەدا هەبێت و ئەم جۆرە هەماهەنگییە دوای هەماهەنگی لەتەك ئاسمان (کە لە ئەنجامی هەماهەنگی تاك دێتە بەرهەم) دەستەبەر دەبێت. لە ژێر سایەی هەماهەنگی کۆمەڵایەتیدا، تاکەکان بەهۆی خۆشگوزەرانی تەواوی کۆمەڵگە، ئەرکەکانی خۆیان سەبارەت بە یەکدی بە شێوەیەکی باشتر ئەنجام دەدەن.

کۆنفوشیۆس بەهۆی ئەو لێکۆڵینەوە قوڵڕوان و بەربلاوەی سەبارەت بە چاینی دێرین هەیبوو، کولتووری چاینی بە کولتووری ئایدیالی خۆی دەزانی و لە تێڕوانینی ئەودا، ئەو کولتوورە ئەوەندە مەزنێتی و شکۆمەندی و پرێستیژی هەبوو، کە هەمیشە داواکاردنی، مۆراڵ و داب و نەریتی ئەو رۆژگاران دەخوات. ئەو دەیگوت تەنها رێگەی رزگاری مرۆڤ و کۆمەڵگە لە خراپەی مۆراڵی و گەندەڵی، گەڕانەوەیە بۆ کولتووری چاینی دێرین و داب و نەریتی پێشینان و بە نموونە دانانی ئەوانە، و خراپەکاری ئەمرۆکەیش دەرەنجامی لادانە لە نەریتی پێشینان. لەم رووەوە، کۆنفوشیۆس بۆ دۆزینەوەی مەزنێتی دووبارەی چاین، لە گەڕانەوە بۆ داب و نەریت و رەفتارنوێنی خەڵکی چاینی دێرین بۆی دەگەڕا و خۆی تەنها، بە گوێزەرەوەی کولتووری دێرینی چاین دەزانی و هەمان باوەڕییش بنەما و پێکهاتەی فێرگەکەی ئەو دیاریدەکات.

کۆنفوشیۆس فێرگەکەی خۆی، کە بەندبوو لەسەر داب و نەریت و مۆراڵی پێشینان، بە جۆرێك سیستەماتیك و دەوڵەمەند کرد، کە تاکێك بە خۆگونجاندنی لەتەك ئەم سیستەمەدا، بشێت بە مرۆڤێکی ئایدیالی بناسێنرێت. کەواتە، مرۆڤی ئایدیالیی ئەم فێرگەیە، کە پێی دەگوترێت "جون زی"[33] یان "مرۆڤی دانا" و "مرۆڤی باڵاتر"، کەسێکە خۆی بە تەواوی لەتەم ئەم سیستەمە مۆراڵی و پەروەردەییەدا گونجاندبێت.

بەوجۆرەی پێشووتر گوترا، بەگوێرەی تێڕوانینی کۆنفوشیۆس، مرۆڤ دەبێت لە نێوان دوو رەهەندی "تاکێتی و کۆمەڵایەتی"دا هەماهەنگی بهێنێتە ئاراوە. بە دەربڕینێکی

33 -Jun Zi

دیکە، مرۆڤ گەرەکە لە "ناوەوە و دەرەوە"ی خۆی یان لە "ژیانی ناوەکی و ژیانی دەرەکی"ی خۆیدا، خاوەن هەماهەنگی بێت. هەماهەنگی ناوەکی بەهۆی "ژێن"[٣٤] دێتە ئاراوە و هەماهەنگی دەرەکی بەهۆی "لی"[٣٥] دێتە بەرهەم. هەڵبەت لە لایەکەوە، هەماهەنگی ناوەکی لە هەماهەنگی دەرەکییەوە سەرچاوە دەگرێت و لەتەکیدا گونجاوە و لە لایەکی دیکەوە، هەماهەنگی دەرەکی کاریگەری لەسەر هەماهەنگی ناوەکی دادەنێت. بە گوتنێکی دیکە، ناوەکی و دەرەکی مرۆڤ لە جۆرێك مامەڵە و هەڵکردن و پەیوەندی بەرانبەردا بەهرەمەندن.

### ١-٢-٣ ژێن

واژەی "ژێن" لە زماندا بە واتای "میهر" و "چاکە" دێت و لە روانگەی زاراوەییەوە، لە هەندێك لە دەقەکانی بەر لە کۆنفوشیۆس، سەرەتا بە واتای "خۆشەویستی سەروەر بەسەر بەندەکەی"دا هاتووە و پاشان بە هەندێك گەشەسەندن، واتای "هەستی خۆشەویستی سەبارەت بە مرۆڤەکان"ی وەرگرتووە و بە "هەستی قوڵی هاوچەشنیی لەتەك مرۆڤەکانی دیکەدا" بەکار هاتووە. بەڵام کۆنفوشیۆس واتایەکی دیکەی بە زاراوەی "ژێن" بەخشی و ئەو واژەیەی بە واتای "مرۆڤایەتی" (تەواو مرۆڤبوون) بەکارهێنا.

لە فێرگەکەی کۆنفوشیۆسدا، ژێن، دایکی فەزیلەتەکانە و هەڵگری هەموو چاکییەکانە و بە بونیادیترین و سەرەکیترین تێگەی ئەم فێرگەیە و ناوەرۆکی فێرکارییەکانی ئەژمار دەکرێت و فێرکارییەکانی دیکە، لەم تێگەیەوە سەرچاوە دەگرن. ژێن، دەربڕی تێڕوانینی ئایدیالیی کۆنفوشیۆسە سەبارەت بە پەروەردە و باڵایەتی مرۆڤ، لەتەك شکۆفەکردنی لێهاتووییەکانی مرۆڤ(٨). ژێن باڵاترە لە تێگەیشتنی مرۆڤی ئاسایی و باڵاترین پلەی مۆراڵی ئایدیالییە و گرنگترین تایبەتمەندییەکانی، برێتین لە

---

34- Ren
35 - Li

هەستکردنێکی قوڵی هاوچەشنیی لەتەك مرۆڤەکانی دیکەدا. ژێن بە جەختکردنەوە لەسەر پەیوەندییە مرۆیییەکان، ئەوە فێری مرۆڤ دەکات، کە چۆن دەشێت فەرمانڕەوای باش، فەرمانبەری باش، باوك و کوڕی باش، برای باش، هاوسەری باش و دراوسێی باش بێت. ژێن بە جەختکردنەوە لەسەر میهرەبانی و دادپەروەری، دەیەوێت مرۆڤی جیهان لەتەك یەکدیدا هەستێکی هاوچەشنیان هەبێت.




**نموونەیەك لە سیستەمی مۆراڵی و پەروەردەیی كۆنفوشیۆس**

کەسی خاوەن ژێن، تەواو مرۆڤ و خاوەن هەر یەك لە فەزیلەتە مرۆییەکانە لە بالآترین پلەدا. ئەو ئاوێنەی هەموو چاکەکان و فەزیلەتەکانە. ئەو بۆ خێزانەکەی باوکێکی حەقیقی، کوڕێکی حەقیقی و برایەکی راستەقینەیە و لە ژیانی کۆییدا هەر شتێکی دروست بێت ئەنجامی دەدات، تەنانەت ئەگەر ئەنجامدانی، بە زیانی خۆیشی تەواو بێت. ئەو وەفادارە بەرانبەر ئەوانەی لەخۆی بالآترن و حەزدەکات خەڵکی بە خۆشگوزەرانییەکی تەواو بگەن.

لە سیستەمی کۆنفوشیۆسیدا، ئەگەرچی زەروورییە خۆشەویستی مرۆیی (ژێن) سەبارەت بە هەمووان دەربېڕێت، بەلآم ئەم خۆشەویستییە نابێت سەبارەت بە هەمووان، بە شێوەیەکی یەکسان نیشان بدرێت، بەڵکو ئەم خۆشەویستییە سەرەتا دەبێت بەرانبەر بە تاکەکانی خێزان و پاشان بۆ ئەوانیدیکە نیشان بدرێت. لەبەر ئەوەی لە نێو خێزاندایە مرۆڤ فێری ئەوە دەبێت بە چ جۆرێك هەستی خۆشەویستی و هاودەردی خۆی دەربېڕێت و ئەگەر مرۆڤ لە نێو خێزاندا نیشاندانی خۆشەویستی فێربووبێت و ئەزموونی کردبێت، ئەوا بە شێوەیەکی سروشتی ئەم هەستی خۆشەویستییە لە دەرەوەی خێزانیشدا نیشان دەدات و هەموو تاکە هاوچەشنەکانیش دەگرێتەوە.

کۆنفوشیۆس قسەی زۆری لەبارەی ژێنەوە کردووە. کاتێك لەبارەی ژێن لێیان پرسی، ئەو گوتی: "ژێن، زاڵبوونە بەسەر خۆپەرستی و هاوکات ئاراستەبوونە رووەو داب و نەریتەکان". (گوتارەکان، ١٢،١). کاتێك لە کۆنفوشیۆس پرسیار کرا لەبارەی تایبەتمەندییەکانی ئەو مرۆڤەی ژێنی هەیە، وەلآمی دایەوە: "مرۆڤی خاوەن ژێن، دەیەوێت خۆی بە بەرزێتی بگەیەنێت، دەخوازێت ئەوانیدیکە بە بەرزێتی بگەن. ئەو گەرەکییەتی خۆی سەرکەوتوو بێت، هاوکات دەخوازێت ئەوانیدیکەیش سەرکەوتوو بن. کەسێك بتوانێت ئەم هەستەی، کە لەبارەی خۆی هەیەتی، لە بەرانبەر ئەوانیدیکەیشدا هەیبێت، ئەوا خاوەن هونەری ژێنە". (گوتارەکان، بەشی ٢٨،٦).

ژێن (هەماهەنگپێدەری ناوەکی مرۆڤ) دوو ڕەهەندی هەیە: ڕەهەندی پۆزەتیڤ (ئەرێنی)، ڕەهەندی نێگەتیڤ (نەرێنی). ئەم دوو ڕەهەندە جیاوازە، لە ژێنەوە سەرچاوە دەگرن و لە ژیانی ناوەکی و ڕواڵەتی مرۆڤدا، خۆیان دەخەنەڕوو. ئەم دوو ڕەهەندە، ئارامی و خۆشی بە ناوەوەی مرۆڤ دەدەن و پەیوەندی دەرەکی ئەو لەتەك تاکەکانی دیکەدا پێشدەخەن، سەرەنجام، ژیانێکی ئارام و پڕ دلۆڤانی بە دیاری بۆ مرۆڤ دەهێنن.

پێناسەکردنی ئەم دوو ڕەهەندە، بە پوختی بەمجۆرەیە:

**ڕەهەندی پۆزەتیڤ**ی ژێن، "جۆنگ"[٣٦]ی پێدەگوترێت و مەبەست لەوەیە "ئەوانیدیکە لەجیاتی خۆ دانان" سەرنجدانە بە لایەنە باشەکەی، واتای ئەوەی مرۆڤ خۆشیدەوێت و بۆ خۆی دەخوازێت، ئەوا بۆ ئەوانیدیکەیشی بخوازێت.

**ڕەهەندی نێگەتیڤ**ی ژێن، "شو"[٣٧]ی پێدەگوترێت و مەبەست لەوەیە "خۆ لە جیاتی ئەوانیدیکە دانان"، سەرنجدانە بە لایەنە خراپەکەی، واتا ئەوەی مرۆڤ بۆ خۆی خۆشیناوێت و نایخوازێت، ئەوا بۆ ئەوانیدیکەیشی نەخوازێت.

جۆنگ و شو لەتەك یەکدیدا، پێیان دەگوترێت **چوارگۆشەی پێوان**، کە ڕەچاوکردنی ئەم چوارگۆشەیە، باشترین پێوەرە بۆ مرۆڤبوون و ڕەفتارنواندنی مرۆییانە.

ڕوونکردنەوەیەکی پوختی ئەم دوو ڕەهەندە، بەمجۆرەیە:

**ڕەهەندی پۆزەتیڤ**ی ژێن، "جۆنگ" یان "ئەرکناسی"یە. مەبەست لە "جۆنگ" بریتییە لەوەی لەتەك ئەوانیدیکەدا وەها ڕەفتار بنوێنیت، کە حەزدەکەیت لەتەك خۆتدا ڕەفتار بنوێنن. بە گوتنێکی دیکە، ئەوەی بۆ خۆتی پەسەند دەکەیت، بۆ ئەوانیدیکەیشی پەسەند بکە. ئەو کەسەی جۆنگی هەیە ئەوانیدیکەی خۆشدەوێت و نیگەرانی هاوچەشنەکانی خۆیەتی، وەها تاکێك بەرژەوەندی ئەوانیدیکە لەپێش بەرژەوەندی خۆی دادەنێت و هەرگیز بەدوای سوودی خۆیدا ناگەڕێت، کە بەزیانی ئەوانیدیکە بێت. ئەگەر لەسەر بنەمای پرەنسیپی جۆنگ بگوترێت ئارامی و

---

36 - Zhong
37- Shu

خۆشگوزەرانی هەر هەرێمێك، پەیوەستە بە حکومەتەکەیەوە، ئەوا مەبەست لەمەیە، کە: "ئەگەر بالاَترەکان لەتەك بەتەمەنەکاندا، بەو جۆرەی شیاوە، رەفتار بنوێنن، ئەوا خەلکیش رەفتارێکی زیرەکانە دەنوێنن، ئەگەر ئەوان لەتەك گەورەکاندا، بەو جۆرەی شیاوە، رەفتار بنوێنن، ئەوا خەلکیش فێری خاکەڕاییەکی برایانە دەبن، ئەگەر ئەوان لەتەك گەنجان و نەدارەکاندا رەفتارێکی دلۆڤانانەیان هەبێتن، ئەوا خەلکیش وەها رەفتار دەنوێنن". (فێرکاری مەزن، بەندی ۲۲)

**رەهەندی نێگەتیڤ**ی ژێن، "شو" یان "مرۆڤدۆستی یان چەشندۆستی"یە. مەبەست لە "شو" برێتییە لەوەی، کە ئەو شتەی بۆ خۆتی بە رەوا نازانی، ئەوا بۆ ئەوانیدیکەیشی بە رەوا مەزانە. بە گوتنێکی دیکە، ئەوەی بۆ خۆتی پەسەند ناکەیت، بۆ ئەوانیدیکەیشی پەسەند مەکە. ئەو کەسەی (شو)ی هەیە، لەبەر ئەوەی ئەوانیدیکە لە جیاتی خۆی دادەنێت، هەرگیز زیانیان پێناگەیەنێت و لەبەر ئەوەی تێگەیشتنێکی دروستی لەبارەی مرۆڤایەتی و مرۆڤەکانی دیکەوە هەیە، لەتەك هاوچەشنەکانی خۆی هاودەردی دەکات و بەم هۆیەوە، لە ئاشتی و ئارامیدا دەژیت. ئەو کەسەی لەسەر بنەمای پرەنسیپی شو رەفتار دەنوێنێت: "ئەوەی بۆ فەرمانداراەکانی خۆی پێویست نییە، ئەوا سەبارەت بە بەرفەرمانەکانیش بە رەوای نازانێت، ئەوەی بۆ بەرفەرمانەکانی پێویست نییە، ئەوا سەبارەت بە فەرمانداراەکانیش بە رەوای نازانێت. ئەوەی بۆ تاکەکانی لای خۆی نایەوێت، ئەوا لەبارەی تاکەکانی ئەولاتریش بە رەوای نازانێت، ئەوەی بۆ تاکەکانی ئەولاتر بە رەوای نازانێت، ئەوا بۆ تاکەکانی لای خۆیشی بە پێویست نازانێت. ئەوەی بە رەوای نازانێت لە لای راست بەکار بهێنرێت، ئەوا لە لای چەپیش بەکاری ناهێنێت، ئەوەی لە لای چەپ بە رەوای نازانێت، ئەوا لە لای راستیش بەکاری ناهێنێت". (فێرکاری مەزن، بەندی ۲۳)

بەگەڕخستنی جۆنگ و شو، یەکسانە بە بەگەڕخستنی ژێن. بەمجۆرە، پرەنسیپی "جۆنگ و شو"، پایەی بەهێزی ژیانی مۆراڵی و پەروەردەیی تاکە و هەرکەسێك دەتوانێت بۆ بەهاپێدانی رەفتاری خۆی، سوود لە "چوارگۆشەی پێوان" (جۆنگ و شو)

وەربگرێت. گوتراوە: "مامۆستا کۆنفوشیۆس، لە کاتی گوتاردان بۆ یەکێك لە شاگردەکانی بە ناوی "شان"[38]، گوتوویەتی: هەموو فێرکارییەکانی من بۆ پرەنسیپێکی تاك دەگەڕێنەوە. "زێنگ"[39] وەلامی دایەوە: بە راستی وەهایە. کاتێك مامۆستا کۆڕەکەی بەجێهێشت، شاگردەکان لە زێنگیان پرسی: مەبەستی مامۆستا لەو گوتنە چی بوو؟ زێنگ وەلامی دایەوە: هەموو فێرکارییەکانی مامۆستا لە پرەنسیپی "جۆنگ و شو"دا پوخت دەبێتەوە، مەبەستی مامۆستا ئەمەیە و بەس". (گوتارەکان، بەشی ٤، ١٥). کۆنفوشیۆس لەبارەی ئاسان بەکارهێنانی ژێن (مرۆڤایەتی) دەڵێت: "ئایا ژێن دوورەدەستە؟ ئەگەر من خوازیاری ژێن بم، ئەوە لای منە". (گوتارەکان، بەشی ٧، ٢٩)

### ٢-٢-٣ لی[40]

"لی"، کە رەنگدانەوەی دەرەکی ژێن و رێنوێنیکاری مرۆڤە لە ژیانی رواڵەتی و کۆمەلایەتیدا، لە زاراوەدا بە واتای "داب و نەریتی پێشینان" دێت و مەبەست لێی، پاراستنی داب و نەریتی پێشینانی چاینی دێرینە. زاراوەی "لی" هەڵگری واتاب بەرفراوان و لەخۆگری هەموو ئەو رەفتارانەیە، کە تاك بەپێی پێویستبوونی هەلومەرجەکان لە خۆیدا دەریدەخات. لەبەر ئەوەی تاکە جیاوازەکان بەپێی پێویستی ئەدەب، لە کات و شوێنە جیاوازەکاندا، چەندین رەفتاری جیاواز دەنوێنن. بۆ نموونە، نابێت مرۆڤ لەتەك خزمەکانی خۆی بەمجۆرە رەفتار بنوێنێت، کە لەتەك بێگانەکاندا دەینوێنێت. لی چەندین جیاوازی هەیە، بۆ نموونە: داب و نەریتی ئایینی (چۆنێتی پاڕانەوە)، داب و نەریتی بەریەککەوتن لەتەك ئەوانیدیکەدا، نەریتی جل و بەرگ پۆشین، داب و نەریتی پەوەندییە جیاوازەکان (نموونەی پەیوەندی نێوان فەرماندار و فەرمانبەر و...). کۆنفوشیۆس هەرچەندە خوازیار و هۆگری داب و نەریتی پێشینان

---

38 - Shan

39 -Zeng

40 -Li

بوو، بەڵام هەمیشە جەختی دەکردەوە لەسەر ئاسانی و کەمخەرجییەکانیان. ئەو باوەڕیی وابوو بە هەر چەشنێك، مرۆڤ لە هەر هەل و مەرجێکدا بێت، دەبێت لەخۆی بپرسێت چ ڕەفتارنواندنێك لەتەك ئەو هەلومەرجەدا شیاوە و پێویستە بەمجۆرە ڕەفتاربنوێنێت.

کۆنفوشیۆس دەیگوت: "مرۆڤایەتی، خۆشویستنە و گرنگترین کاری، خۆشەویستنی خزمانە. میانەڕەوی، ئەنجامدانی دروستی هەرشتێکە و گرنگترین کاری، بەهادانانە بۆ پێشینان. ڕەچاوکردنی پلەکانی خۆشەویستی سەبارەت بە خزمان و پلەکانی بەهادانان سەبارەت بە پێشینان، کاری داب و نەریتەکان (لی)ـە". (ڕێبازی میانەڕەوی، بەشی ٢،٦).

کۆنفوشیۆس باوەڕیی وابوو ئاڵۆزی و پشێوییە کۆمەڵایەتییەکان لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، کە داب و نەریتی چاینی دێرین، کە دەبێتە هۆی پەیوەندی پتەوی مرۆڤەکان، فەرامۆشکراوە و بۆ ڕێکخستن و دیسپلینکردنی کۆمەڵگە، چارەیەکمان نییە جگە لە گەڕانەوە بۆ داب و نەریتی پێشینان و پاراستنی ئەو داب و نەریتانە، لەبەر ئەوەی پێشینان بە میانەڕەوی و ئەدەبەوە ڕەفتاریان دەنواند و خوازیاری خۆشگوزەرانی گشتی بوون، ئەوا کۆمەڵگاکەیان میانەڕەو و خۆشگوزەران بوو. لەم ڕووەوە، کۆنفوشیۆس دەیگوت ئەگەر خراپەکارییەك لە کەسێکدا دەربکەوێت، ئەوا بەهۆی خراپەیی ئەو نییە، بەڵکو تەنها بەهۆی کەمتەرخەمی ئەوە لە ئەنجامدانی ئەرکەکانی و ڕەچاونەکردنی داب و نەریتەکان (بەو جۆرەی، کە پێویستە). کەواتە، بۆ دانانی هەماهەنگی ڕەفتارنواندن لە کۆمەڵگەدت، پێویستە داب و نەریتی ڕەفتارنواندن بە وردییەکی تایبەتی ئەنجام بدرێت بۆ ئەوەی پەیوەندی نێوان تاکەکان لە کۆمەڵگەدا باشتر ببێت و مۆراڵی کۆمەڵایەتی بە یەکسانی بگات.

کۆنفوشیۆس باوەڕیی وابوو، کە تاکەکان نە تەنها بە گوتار و ڕەفتار، بەڵکو بە هاوکاری مۆسیقاش-کە توانستێکی هۆشسامکەری هەیە لە وروژاندنی سۆزە مرۆییەکاندا- دەتوانن لەتەك یەکدیدا پەیوەندی دابمەزرێنن و مامەڵە بکەن. هەڵبەت مەبەستی ئەو لە مۆسیقا، مۆسیقایەکی تەندروست بوو، کە بشێت ببێتە

ئیلهامبەخشی ڕۆح و دەروون و ببێتە هۆی هەستکردن بە خۆشی و ئارامی.

هەرچۆنێك بێت، کۆنفوشیۆس جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە، کە نابێت مرۆڤ جەوهەری مرۆڤایەتی و خۆشی ناوەکیانە فەرامۆش بکات، چونکە ئەوانە دەبن هۆکارێك بۆ پەیوەندی دروستکردن و کاریگەرییەکانی ئەم پەیوەندیانە. ئەو دەیگوت: "ئەگەر کەسێك جەوهەری مرۆیی (ژێن)ی نەبێت، ئەوا داب و نەریت دەشێت چی بۆ ئەو بکات؟ کەسێت جەوهەری مرۆیی نەبێت، ئەوا مۆسیقا دەتوانێت چی بۆ ئەو بکات؟". (گوتارەکان، بەشی ٣،٣) ئەو باوەڕیی وابوو ئەگەر لی لە دەروونێکی پاکەوە سەرچاوەی گرتبێت، ئەوا دەبێتە سەرچاوەی کاریگەریی و تایبەتمەندێتی باشی مرۆڤ (ژێن) نیشان دەدات، و بە ڕەچاوکردنی راستیبیانەی لی، بناغەی کۆمەڵگە پتەوتر دەبێت و خەڵکی لە دۆخی ئاشتی و لێبوردەیی و یەکترقبوڵکردندا ژیان دەگوزەرێنن، هەر بەو جۆرەی خەڵکی چاینی دێرین وەها دەژیان.

کۆنفوشیۆس بۆ هێنانە ئارای میانەڕەوی لە کۆمەڵگەدا، جەختی لەسەر دامەزراندنی پەیوەندی مرۆیی دەکردەوە وەکو کەلەپوورێك لە داب و نەریتەکانی چاینی دێرین، و تیۆرییەکی بە ناوونیشانی "پەیوەندی پێنجەمین" دارشت. پەیوەندی پێنجەمین وەکو راستینەیەکی دیاری لی، لە یەکێك لە بەرهەمەکانی کۆنفوشیۆس (کتێبی داب و نەریتەکان، بەشی ١٩،٢،٧) بەم شێوەیەی خوارەوە هاتووە:

١- پەیوەندیی باوك و کوڕ: باوك دەبێت لەتەك کوڕەکەیدا دڵاوا بێت و کوڕیش دەبێت سەبارەت بە باوکی، ئەرکی منداڵانەی خۆی بەجێبهێنێت.

٢- پەیوەندیی برا گەورە و برا بچووك: برا گەورە دەبێت گەورەیی بنوێنێت و برا بچووکیش پێویستە فەرمانەکانی برا گەورە جێبەجێ بکات.

٣- پەیوەندیی ژن و مێرد (هاوسەر): پیاوەکە دەبێت سەبارەت بە ژنەکەی، ڕەفتارێکی میانەڕەوانە بنوێنێت و ژنیش پێویستە گوێڕایەڵی مێردەکەی بێت.

٤- پەیوەندیی گەورە و بچووك: گەورە دەبێت لەتەك بچووکدا ڕەفتاری میهرەبانانە بنوێنێت و بچووکیش پێویستە پاسەوانی گەورەکە بکات.

٥- پەیوەندی سەروەر و بەندە (یان ئاغا و کۆیلە): سەروەر دەبێت سەبارەت بە

بەندەکەی، چاکەخواز بێت و بەندەکەیش پێویستە وەفای بۆ سەروەرەکەی هەبێت.

هەڵبەت ئەم پێنج پەیوەندییە لە شوێنی دیکەیش(ڕێبازی میانەڕەوی، بەشی ۲، ۹)دا باسکراون، لەو کتێبەدا لە جیاتی "پەیوەندیی گەورە و بچووك"، "پەیوەندیی هاوڕێ لەتەك هاوڕێ" هاتووە.

لەبەر ئەوەی سێنتەری خێزان، بناغە و بنەمای کۆمەڵگەی مرۆییە، ئەوا کۆنفوشیۆس جەختی لەسەر پەیوەندییە باشەکانی تاکەکانی نێو خێزان دەکردەوە و باوەڕیی وابوو ئەگەر پەیوەندییەکان لە نێو سێنتەری خێزاندا، گەرم و گوڕ و باش بن، ئەوا پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیش گەرم و گوڕ و باش دەبن. لەبەر ئەوەیە سێ پەیوەندییەکەی سەرەتا لە پێنج پەیوەندییەکە، تایبەتن بە خێزان و هەندێك لە راستییەکانی پەیوەندیی پێنجەمیش پەیوەستە بە پەیوەندی خێزانییەوە. سەبارەت بە گرنگی پەیوەندی خێزانی گوتراوە: "خۆشەویستی شادومانانەی هاوسەر لەتەك ژنەکەی و منداڵەکەی، وەکو دەنگی چەنگ[٤١] و رۆبابە[٤٢]یە. کاتێك براکان بەیەکەوە هەڵبکەن، ئەوا هارمۆنییەکە قبوڵکراو و پایەدار دەبێت. کەواتە ئەگەر لەتەك خێزاندا میانەڕەو بیت، ئەوا لە زۆرترین خۆشی و شیرینی ژن و منداڵ بەهرەمەند دەبیت". (ڕێبازی میانەڕەوی، بەشی ۱، ٤٢).

بە تێڕوانینی کۆنفوشیۆس، پەیوەندیی باوك و منداڵەکەی، گرنگترین و بنەڕەتیترین پەیوەندی و سەرچاوەی هەموو پەیوەندییەکانە و نەك تەنها هەر لەکاتی زیندوێتیدا، بەڵکو دەبێت دوای مردنیش ڕێزگرتن لەباوك هەر هەبێت. لە بەرانبەردا، باوکیش ئەرکی سەرشانییەتی بۆ خۆشگوزەرانی و تەندروستی تاکەکانی نێو خێزان هەوڵ بدات و منداڵەکانی بە چەندین سیفەتی باش پەروەردە بکات و خۆی بۆ منداڵەکانی باشترین نموونەی مۆراڵی بێت[(٩)].

کۆنفوشیۆس لەبارەی پاراستنی ڕێزی باوك دەڵێت: "تا ئەوکاتەی باوکت لە ژیاندایە، دەبێت بەپێی ویستی ئەو رەفتار بنوێنیت، و ئەو کاتەی باوکت ژیانی بەجێهێشت، ئەوا

---

٤١- چەنگ: سازێکی ژێدارە، کە حەوت سیمی هەیە و بە پەنجە لێدەدرێت. (وەرگێڕ)

٤٢ - سازێکی کۆنە و لە تار دەچێت. (وەرگێر)

دەبێت ڕەفتارەکانی ئەو بکەیتە نموونەی خۆت. ئەگەر تۆ توانستی ئەوەت هەبوو بۆ ماوەی سێ ساڵ لەسەر هەمان شێوازی ڕەفتارنوێنی باوکت بمێنیتەوە، ئەوا لەو شێوەیەدا دەشێت تۆ وەکو منداڵێکی جێگرەوە دابنرێیت". (گوتارەکان، بەشی ١، ١١). "تا ئەو کاتەی دایك و باوکت لە ژیاندان، پێویستە بەپێی نەریتەکان لە خزمەتی ئەواندا بیت، کاتێك ژیانیان جێهێشت، دەبێت بەپێی نەریتەکان بەخاکیان بسپێریت و دوای ئەوە یادیان بەرز ڕابگریت)). (گوتارەکان، بەشی ٢، ٥). ئەو لەبارەی منداڵی باشەوە دەڵێت: "ئەمڕۆکە باشبوونی منداڵ بە مانای توانستی دابینکردنی خواردنی دایك و باوك دێت، بەڵام ئەم کارە هەموو کەسێك تەنانەت بۆ ئەسپ و سەگیش ئەنجامی دەدات. ئەگەر ڕێزگرتنێك لەم نێوەدا نەبێت، ئەوا چ جیاوازییەك لە نێوان ئەم دوو کارەدا هەیە؟" (گوتارەکان، بەشی ٢، ٧). ئەو لەبارەی ئەرکی منداڵیش دەڵێت: "مامۆستا گوتی: ئەو منداڵەی لە خزمەتی دایك و باوکی دایە، لەوانەیە هەندێك کات بخوازێت تێڕوانینی ئەوان گۆڕان بگۆڕێت، بەڵام ئەگەر ئەوان ئەوە قبوڵ نەکەن، ئەوا منداڵەکە دەبێت ڕێزیان بگرێت، نابێت لێیان دوور بکەوێتەوە و پێویستە ناڕەزایەتی دەرنەبڕێت. تا ئەو کاتەی دایکی و باوکی زیندوون، باشترین شت ئەوەیە منداڵەکە هەوڵی گەشتی دوور و درێژماوە نەدات، ئەگەریش گەشتی کرد، دەبێت مەبەستەکەی ڕوون و ئاشکرا بێت". (گوتارەکان، بەشی ٤، ١٨-١٩).

لە وەڵامی دەستەڵاتدارێکدا، کە ئەو چاکەی خەڵکی هەرێمەکەی بەم جۆرە پێناسە دەکات، کە ئەگەر باوکێك مەڕێك بدزێت، ئەوا کوڕەکەی دژ بەو هەواڵ دەدات، ئەوا کۆنفوشیۆس دەڵێت: "خەڵکی باشی سەرزەمینی من بەمجۆرە نین، باوك چاو لە هەڵەی کوڕەکەی دەپۆشێت و کوڕەکە چاو لە هەڵەی ئەو دەپۆشێت. ڕاستی ئەمەیە". (گوتارەکان، بەشی ١٣، ١٨).

کۆنفوشیۆس لەبارەی پاراستنی پێشینان و داب و نەریتەکانیان دەڵێت: "ئەوان لە شوێنی باووباپیرانیان کۆدەبوونەوە، ڕێ و ڕەسمی پێشینانیان ئەنجام دەدا، مۆسیقای پێشووترەکانیان دەژەنی. ئەوان یادی ئەو کەسانەیان بەرز ڕادەگرت، کە لای پێشینانیان ڕێزیان بۆ دانرابوو، ئەو کەسانەی پێشینانیان خۆشیاندەویستن، ئەوانیش خۆشیاندەویستن. بەمجۆرە، ئەوان بەجۆرێك خزمەتی مردووەکانیان دەکرد، کە دەتگوت

هێشتاش زیندوون، ئەوان وەها خزمەتی رۆیشتووەکانیان دەکرد، کە دەتگوت هێشتاش لە نێویاندان. ئەوان بە ئەنجامدانی رێ و رەسمی قوربانی بۆ ئاسمان و زەوی، ملکەچی خوداوەند دەبوون، ئەوان بە جێبەجێکردنی کولتی (سروت) قوربانی لە پەرستگای باووباپیرانیاندا، رێزی یادکردنەوەی پێشینانیان دەگرت. ئەو کەسەی لە واتای کولتی قوربانیکردن بۆ ئاسمان و زەوی تێدەگات و هاوکات لە واتای قوربانیکردن بۆ پێشینان دەگات، وەها بە ئارامییەوە دەتوانێت فەرمانڕەوایی بەسەر هەرێمەکەدا بکات، کە دەڵێی سەیری لەپی دەستی خۆی دەکات". (رێبازی میانەڕەوی، بەشی ١، ٥٨-٦٠)

پێنج ئاکارباشیی[١٠](فەزیلەت)ەکەی کۆنفوشیۆسی-کە پەیوەستن بە خێزان و کۆمەڵگاوە- بریتین لە:

١- **ژێن**[٤٣] یان **مرۆیی:** بەبێ مرۆڤایەتی، ئەوا هیچ فەزیلەتێك نامێنێتەوە. ئەم فەزیلەتە پەیوەست دەبێت بە دایك و باوك و منداڵەکانییەوە.

٢- **یی**[٤٤] یان **میانەڕەوی:** ئەم فەزیلەتە پەیوەستە بە پەیوەندیی نێوان سەروەر و بەندە.

٣- **لی**[٤٥] یان **داب و نەریتەکان:** ئەم فەزیلە پەیوەستە بە پەیوەندیی نێوان ژن و مێردەوە.

٤- **جی**[٤٦] یان **دانایی:** ئەم فەزیلەتە پەیوەستە بە پەیوەندی نێوان براگەورە و برابچووکەوە.

٥- **سین**[٤٧] یان **راستگۆیی** لە فیکر، گوتار و کرداردا: ئەم فەزیلەتە پەیوەستە بە پەیوەندیی نێوان گەورە و بچووکەوە.

سێ فەزیلەتەکەی کۆنفوشیۆسی (رێبازی میانەڕەوی، بەشی ٢، ٩)-کە پەیوەستن بە تاکی مرۆییەوە- بریتین لە:

---

43 -Ren
44 -Yi
45 -Li
46-Zhi
47 -Xin

١- **دانایی**، کە گومان و ڕاڕایی لەنێو دەبات.
٢- **مرۆیی** (یان مرۆڤایەتی)، کە دەبێتە هۆی ئارامیی دەروون.
٤- **بوێری** (یان شەهامەت)، کە مرۆڤ لە ترس ڕزگار دەکات.

## ٣-٢-٣ جون زی[48]

دوای کۆتاییهێنان بە لێکۆڵینەوە لە "ژێن" و "لی"، ئەوا پێویست دەکات ئاماژە بکرێت بە "جون زی" یان "مرۆڤی دانا"، کە مرۆڤیی ئایدیالیی کۆنفوشیۆسە، هەرچەندە باسەکانی پێشووتر "ژێن" و "لی"، لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی ئەدگار و تایبەتمەندییەکانی مرۆڤی دانا یان فەرزانەیە. زاراوەی "جون زی" بەر لە کۆنفوشیۆس، لە بنەڕەتدا بۆ ئاریستۆکراتییەك بەکار دەهات، کە ڕەفتارێکی خانەدانانە و ئاریستۆکراتییانەی دەنواند، بەڵام کۆنفوشیۆس واتایەکی تازەی بەم زاراوەیە بەخشی، کە هەمان مرۆڤی دانایە.

مرۆڤی دانا، مرۆڤی ئایدیالیی کۆنفوشیۆس و هەڵگری هەموو فەزیلەتە مرۆییەکانە. جون زی، لەبەر ئەوەی لە ناوەرۆکدا هەڵگری ژێنە، ئەوا لە ڕواڵەتیشدا وێنەی لی دەداتەوە. بە گوتنێکی دیکە، ئەو ئاوێنەی تەواوی ژێن و لی و، هەموو فەزیلەتە مرۆییەکانە. مرۆڤی دانا بە پێنج تایبەتمەندی(خەسڵەت) ڕازاوەتەوە (گوتارەکان، بەشی ١٧، ٦):

- **لەسەرخۆیی:** ئەگەر پشوودرێژ و لەسەر خۆبیت، ئەوا هیچ بێ ڕێزییەکت بەرانبەر ناکرێت.
- **بەخشندەیی:** ئەگەر بەخشندە بیت، ئەوا هەموو شتێکت دەبێت.
- **ڕاستگۆیی:** ئەگەر ڕاستگۆ بیت، ئەوا باوەڕپێکراو دەبیت.
- **جدیی:** ئەگەر جدییەتت هەبێت، ئەوا بە دەرەنجامی باش دەگەیت.
- **خۆشەویستیی:** ئەگەر خۆشەویستیت هەبێت، ئەوا خەڵکی لە خزمەتت دادەبن.

---

48 -Jun Zi

مرۆڤی دانا، سادە و ڕاستکارە. ئەو بەو جۆرەی خۆی باش و پەروەردە کردووە، ئەوا مەبەستییەتی ئەوانیدیکەیش باش و پەروەردە بکات، ئەو خاوەنی میانەڕەوییە لە هزر و کرداردا. ئەو بەر لە ئەنجامدانی هەر کار و کردنی هەر قسەیەکدا، تێڕادەمێنێت و ڕاستگۆیی لە گوتار و کرداریدا هەیە[11]. "مرۆڤی دانا، لە گوتاردا دوورنوارِ و لە کرداردا پایەدارە". (گوتارەکان، بەشی ٤، ٢٤). "مرۆڤی دانا، لە ڕەفتارنواندندا، خۆی بەدووردەگرێت لە بێ شەرمی و لووتبەرزیی،... مرۆڤی دانا لە گوتارداندا، دووردەکەوێتەوە لە فرەوێژیی و خراپوێژی". (گوتارەکان، بەشی ٨، ٤). "مرۆڤی دانا، وردبینە، بەڵام توندوتیژ نییە". (گوتارەکان، بەشی ١٥، ٣٦).

کۆنفوشیۆس دەڵێت: "مرۆڤی مەزن سەرباری ئەوەی میانەڕەوە، بەڵام شوێن چڵێتان (عوام) ناکەوێت، مرۆڤی بچووك سەرباری ئەوەی میانەڕەو نییە، شوێن چڵێتان (یان ڕەشەخەڵك) دەکەوێت". (گوتارەکان، بەشی ١٣، ٣). "مرۆڤی مەزن ئەوەی دەیخوازێت لای خۆی هەیەتی، بەڵام مرۆڤی بچووك ئەوەی گەرەکییەتی لای یەکێکی دیکەیە". (گوتارەکان، بەشی ١٥، ٢٠). "مرۆڤی مەزن نیگەرانی فەزیلەتە، بەڵام مرۆڤی بچووك نیگەرانی بەرژەوەندییە. مرۆڤی مەزن خوازیاری دیسپلین و ڕێکوپێکییە، بەڵام مرۆڤی بچووك خوازیاریی پاداشت و بەرژەوەندییە". (گوتارەکان، بەشی ٤، ١١). "مرۆڤی مەزن سەرنجی سیفەتە پەسەندکراوەکانی خەڵکی دەدات، نەك سیفەتە ناپەسەندەکانیان، بەڵام مرۆڤی بچووك بەپێچەوانەوەیە". (گوتارەکان، بەشی ١٢، ١٦).

## ٣-٣ یۆتۆپیا (یان شاری ئایدیالیی)

سیاسەتی ئایدیالیی کۆنفوشیۆس سیاسەتێکە، کە سەرەنجام دەگۆڕێت بۆ حکومەتێکی جیهانی بە ناوی "دا تۆنگ"[49] یان "هارمۆنی مەزن". هەڵبەت هارمۆنی (یان هەماهەنگی) مەزن، کە سەرەنجامەکەی کۆمەڵگایەکی یەکێتی و

49 - Da Tong

میانەڕەوە، کاتێك دەستەبەر دەبێت، کە سەروەر(یان حاکم)ێکی دانا (کە لە هارمۆنی و میانەڕەوی رۆحی بەهرەمەندە) فەرمانڕەوایی بکات بۆ ئەوەی لە سایەیدا، خەڵکیش بەپێی دائۆ رەفتاربنوێنن و بە هارمۆنی و میانەڕەوی بگەن. بەم شێوەیەیە، کە یۆتۆپیا (کۆمەڵگای ئایدیالیی) دێتە ئاراوە.

بە تێڕوانینی کۆنفوشیۆس، پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە:

**قۆناغی یەکەم،** قۆناغی نارێکخراویی ئاشکرا.

**قۆناغی دووەم،** قۆناغی ئارامی بچووك.

**قۆناغی سێیەم،** قۆناغی هارمۆنیی مەزن.

کۆنفوشیۆس بەهۆی ئەو پەیوەندییەی لەتەك کولتوور و داب و نەریتەکانی چاینی کۆندا هەیبوو، باوەڕیی وابوو لە رۆژگارانی کۆنی چایندا، حکومەتێکی ئایدیالیی بە هارمۆنییەکی مەزنەوە بوونی هەبووە. ئەو بەمجۆرە باسە لە هارمۆنی مەزنی ئەو رۆژگارانە: "ئەو کاتە، کە بەپێی دائۆ کار دەکرا، رۆحێکی هاوبەش و گشتی، کە لە ژێر ئاسمان بوو، حوکمی دەکرد. مرۆڤە کارامە و بە هونەرەکان، چەندین پۆستی شایستەیان پێدەبەخشرا و راستگۆیی ئەوان تۆوی برایەتی دەچاند. لەم رووەوە، خەڵکی تەنها باوك و دایکی خۆیان خۆشنەدەویست و تەنها منداڵانی خۆیان گەرەکنەبوون، ئەوان پەرستاریی بە تەمەنەکانیان دەکرد تا کاتی مردن، بۆ بە هێزەکان، کار و بۆ گەنجان، ئامرازی ژیانیان دابین دەکرد، لەتەك بێوەکان میهرەبان بوون، ئاگاداری هەتیوان و بێکەسان و هەروەها ئاگاداری نەخۆشەکانیش دەبوون. لەو شتانە بێزار بوون، کە بە بێهودەیی لێرە و لەوێ دەرژان و هیچ شتێکیان بۆ سوودی خۆیان کەڵەکە نەدەکرد، ئەوان لە توانست و هێزی بەکار نەهاتوو بێزار بوون و سەرباری هەموو ئەمانە، ئەمانەیان بۆ سوود و بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بەکار نەدەهێنا. بەمجۆرە بوو، کە مەیلی خۆپەرستی بواری گەشەکردنی نەبوو، دز و چەتە و رێگر و خیانەتکاران لەم نێوەدا نەبوون، بە جۆرێك دەرگای هەرماڵێك کراوە بوو بێ ئەوەی هیچ ترسێکیان لە هەر جۆرە ئازاردانێك هەبێت. ئەو سەردەمە، سەردەمی

هارمۆنیی مەزن بوو". (کتێبی داب و نەریتەکان، بەشی ٧، ١، ٢)[١٢].

بە شێوەیەکی گشتی دەشێت بڵێین لە سیستەمی سیاسیی کۆنفوشیۆسدا، دوو فاکتەر زۆر گرنگ بوون بۆ ریفۆرمی کاروبارەکانی وڵات و گەیشتن بە حکومەتێکی ئایدیالی و کۆمەڵگایەکی ئایدیالی (یۆتۆپیا)-کە هەڵبەت فاکتەری دووەم بەندە لەسەر هەبوونی فاکتەری یەکەم. دوو فاکتەری گرنگ، بریتین لە: **ریفۆرمی دەستەڵاتدار**[٥٠] و **ریفۆرمی فۆرمەکان**، کە بەمجۆرە راڤە دەکرێن:

**A. ریفۆرمی دەستەڵاتدار:** مەبەست لەوەیە سەروەر و فەرمانڕەوا، دەبێت تاکێکی خۆپەروەردە و خاوەنی میانەڕەوی و هارمۆنی رۆحی بێت و بە گوتنێکی دیکە، تاکێك بێت بە تەواوی رازابێتەوە بە ژێن و لی (ئەدگاری مرۆڤی دانا). کەواتە، سەروەر پێویستە تاکێکی دانا بێت. کۆنفوشیۆس زێتر لەوەی تێڕوانینی لەسەر جۆر و شێوازی حکومەت چڕ بکاتەوە، سەرنج دەداتە سەر کەسێتی سەروەر و ئەدگارەکانی. بەپێی تێڕوانینەکەی ئەو، ئەگەر کەسێتی دەستەڵاتدار لێهاتوو و یەکسانخواز بێت، ئەوا بەڕێوەبەردنی کاروباری وڵات بە شێوەیەکی شایستە و هارمۆنی و هەماهەنگ بەڕێوە دەچێت و ئەگەریش کەسێتی سەروەر ناشایستە و نایەکسانخواز بێت، ناچارەکییانە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتیش ناشایستە و ناهارمۆنی و ناهەماهەنگ دەبێت. کۆنفوشیۆس دەڵێت: "ئەگەر سەروەر بتوانێت ریفۆرم لەخۆیدا بکات، ئەوا حکومەت هیچ کێشەیەکی نابێت، خۆ ئەگەر سەروەر نەیتوانی ریفۆرم لەخۆیدا بکات، ئەی چۆن دەتوانێت ریفۆرم لەوانیدیکەدا بکات؟". (گوتارەکان، بەشی ١٣، ١٣).

کۆنفوشیۆس دانانی مرۆڤی شایستە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات بە گەرەنتی مانەوەی حکومەت دادەنێت. ئەو رۆژێك بە فەرمانڕەوای ویلایەتی لوی گوت: "ئەگەر مرۆڤی شایستە لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی وڵاتدا هەبن، ئەوا حکومەت باش دەبێت و بەبێ بوونی ئەم مرۆڤانە، حکومەت رووەو نشوستهێنان دەچێت. بەرەوپێشەوەچوونی

---

٥٠ - سەروەر یان حاکم

حکومەت بە هەبوونی مرۆڤی شایستە، کارەکانی خێرا دەبن، هەر بەو جۆرەی گەشەکردنی گژوگیای سەرزەوی خێرایە. حکومەت وەکو گیایەکی خۆڕسکە. لەم رووەوە، کاری حکومەت پەیوەندی بە کارگێڕی مرۆڤانی شایستەوە هەیە. ئەم مرۆڤانە، بە ئەدگاری باشەوە، فەرمانڕەواکەشیان دەڕازێتەوە. دەسەڵاتدار بۆ خۆ رازاندنەوەی بە ئەدگاری پەسەند، پێویستە پەیڕەوی لە دائۆ بکات، پەیڕەویکردنیش لە دائۆ بەهۆی ژێن (مرۆڤایەتی، میانەڕەوی تەواوی رۆحی) دەستەبەر دەبێت". (رێبازی میانەڕەوی، بەشی ٢، ١-٥).

کۆنفوشیۆس چاکسازی دەستەڵاتدار بۆ خۆشگوزەرانی خەڵکی بەمجۆرە شیدەکاتەوە: "دەستەڵاتداران لە رۆژگارانی رابوردوودا، لەبەر ئەوەی خوازیاری خۆشگوزەرانی هەموو خەڵکی بوون، بۆیە گۆڕانکارییان لە کاروباری وڵاتدا دەکرد. بۆ ریفۆرمکردن لە کاروبارەکانی وڵات، ناچار بوون چاکسازی لە خێزانی خۆیاندا بکەن، بۆ چاکسازیکردن لە کاروباری خێزاندا، دەبوو خۆیان پەروەردە بکەن، بۆ پەروەردەکردنی خۆیشیان، پێویست بوو دڵ و دەروونیان پاك بکەنەوە، بۆ پاککردنەوەی دڵ و دەروونیش، پێویست بوو بڕوای راستەقینەیان هەبێت، بۆ بڕوای راستەقینەش، ناچاربوون زانین و زانست دەستەبەر بکەن، بۆ دەستەبەرکردنی زانین و زانستیش، ناچار بوون وێڵی لێکۆڵینەوە و زانینی حەقیقەتەکان بن. ئەوان بەهۆی لێکۆڵینەوە و گەڕان، حەقیقەتەکانیان ناسی، بۆیە بوونە خاوەنی زانست و زانین، لەبەر ئەوەی بوونە خاوەنی زانست و زانین، ئەوا بوونە خاوەنی بڕوای راستەقینە، لەبەر ئەوەی بوونە خاوەنی بڕوای راستەقینە، دڵ و دەروونیان لە ناپاکی خاوێن بۆوە، لەبەر ئەوەی دڵ و دەروونیان لە ناپاکی خاوێن بۆوە، بەمجۆرە پەروەردە بوون بەرهەم هات، لەبەر ئەوەی خۆیان پەروەردە کرد، ئەوا کاروباری خێزانەکانیان باش بوو و رێکوپێك کرا، لەبەر ئەوەی کاروباری خێزانەکانیان چاکسازی تێدا کرا، ئەوا کاروبارەکانی وڵاتیش چاکسازیان تێدا کرا و لەبەر ئەوەی کاروبارەکانی وڵاتیش رێکخران، ئەوا هەموو خەڵکی بە خۆشگوزەرانی گەیشتن". (فێرکاری مەزن، بەندی ٢-٥)(١٣).




**نموونەی چاکسازی دستەڵاتدار و حکومەت**

به تێڕوانینی کۆنفوشیۆس، بەم ئەندازەیەیە، کە دەستەڵاتداری شایستە دەتوانێت گەرەنتی ئاساییش و خۆشگوزەرانی خەڵکی بکات، دەستەڵاتداری ناشایستەش دەتوانێت ئاساییش و خۆشگوزەرانی خەڵکی بخاتە مەترسییەوە و وای لێبکات خراپتر بێت لە هەر ئاژەڵێکی دڕندە. دەڵێن کۆنفوشیۆس رۆژێك لەتەك شاگردەکانی بە دەشتێکدا تێپەڕدەبوون، ژنێکیان بینی، کە لەسەر گۆڕێك دەگریا. داوای لە یەکێك لە شاگردەکانی کرد لەو ژنە بپرسن و بزانن بۆچی دەگریت. ژنەکە گوتی: "ئەمە گۆڕی کوڕەکەمە، کە پڵنگێکی دڕندە کوشتی و گۆڕی براو هاوسەر و خەزوورم هەر لێرەیە، کە هەموویان بوونە خۆراکی پڵنگی دڕندە و ئەم جۆرە پڵنگانەش لێرە زۆرن". شاگردەکە گەڕایەوە و ئەوەی بیستبووی، بۆ مامۆستاکەی گێڕایەوە. مامۆستا جارێکی دیکە لە شاگردەکەی داوا کرد لە ژنەکە بپرسێت، کە سەرباری ئەمە، بۆچی ئێرە بەجێناهێڵێت و ناچێتە شوێنێکی دیکە، کە پڵنگی دڕندەی لێنەبێت. ژنەکە وەڵامی دایەوە: "لەبەر ئەوە ئێرە بەجێناهێڵم، چونکە دەستەڵاتدارەکەی ئێرە زۆر دادپەروەرە". شاگردەکە گەڕایەوە و وەڵامی ژنەکەی گێڕایەوە. پاشان کۆنفوشیۆس رووی لە شاگردەکانی کرد و گوتی: "لەیادتان بێت، کە دەستەڵاتداری ستەمکار زۆر لە پڵنگی دڕندە، دڕندەترە".

کۆنفوشیۆس باوەڕیی وابوو دەستەڵاتداری باش و شایستە بە دابینکردنی ئاشتی و ئاساییش بۆ خەڵکی، ئەوا متمانەی ئەوان بەدەستدەهێنێت و ئەمەش گرنگترین فاکتەرە بۆ مانەوەی پاشا و وڵات. رۆژێك یەکێك لە شاگردەکانی کۆنفوشیۆس بە ناوی "زی گۆنگ"[٥١]، لەبارەی بنەماکانی مانەوەی حکومەت پرسیاری لە مامۆستاکەی کرد. مامۆستا وەهای گوت: "بونیادی حکومەتێك لەسەر سێ شت وەستاوە، کە حکومەت پشتیان پێ دەبەستێت: خۆراکی تەواو، چەکی تەواو، و

51- Zi Gong

متمانەی خەڵکی". زی گۆنگ پرسی: "وای دابنێ ئەگەر ناچار بیت چاو لە یەکێك لەم سێ فاکتەرە بپۆشیت، کامەیان وەلا دەنێیت؟" مامۆستا وەڵامی دایەوە: "لە چەك". زی گۆنگ پرسی: "وای دابنێ ئەگەر ناچار بیت چاو لە یەکێك لەم دوو فاکتەرەی دیکە بپۆشیت، کامەیان وەلا دەنێیت؟" مامۆستا وەڵامی دایەوە: "لە خۆراك، چونکە لە کۆنەوە مەرگی چارەنووسی ناچارەکیانەی هەموو خەڵکی بووە". (گوتارەکان، بەشی ١٢، ٧). مەبەستی کۆنفوشیۆس ئەمە بوو، کە ئەگەر متمانەی خەڵکی نەبێت، ئەوا حکومەتیش پایەدار نابێت و لە حکومەتێکی شایستەدا، دەستەڵاتداری وڵاتێك، نیگەرانی نەبوونی سامان نییە، بەڵکو نیگەرانی دابەشکردنی دادپەروەرانەی سامانەکەیە، نیگەرانی هەژاری نییە، بەڵکو نیگەرانی نائارامییە، لەبەر ئەوەی ئەگەر دابەشکردنی سامان دادپەروەرانە بێت، ئەوا هەژاریش بوونی نامێنێت، ئەگەر هارمۆنی و میانەڕەوی هەبێت، ئەوا باسێکیش لەبارەی هەژارییەوە بوونی نابێت، ئەگەر رەزامەندی و متمانە هەبێت، ئەوا راپەڕینیش روونادات(١٤).

کۆنفوشیۆس ئەوەندە جەختی لەسەر پێویستیی شایستەیی دەستەڵاتدار دەکردەوە، کە دەیگوت ئەگەر دەستەڵاتدار شایستە (یان لێهاتوو) نەبێت، ئەوا دانانی یاساکان، هیچ کارێك بەرەو پێشەوە نابەن. رۆژێك زی گۆنگ لەبارەی لەخاچدانی یاخییان و سەرکێشانی یاساشکێن لە کۆنفوشیۆسی پرسی. مامۆستا وەڵامی دایەوە: "پێویست بە کوشتن ناکات. ئەگەر ئێوە باش بن، ئەوا خەڵکیش باش دەبن. کەسێتی دەستەڵاتداری شایستە، وەکو بایە و سروشتی مرۆڤیش وەکو گیایە، ئەگەر با هەڵبکات، ئەوا گیا لە بەرانبەریدا پەرش و بڵاو دەبێت". (گوتارەکان، بەشی ١٢، ١٩). بە گوتنێکی دیکە، ئەگەر خەڵکی متمانەیان بە دەستەڵاتدار هەبێت لە بەرانبەر فرمانەکانیدا، سەر دادەنەوێنن و ئەگەریش دەستەڵاتدار شایستە نەبێت، ئەوا یاساکان هیچ بەرهەمێکیان نابێت.

دەڵێن کاتێك کۆنفوشیۆس پۆستی حکومی هەبووە لە ویلایەتی لو، لە پراکتیکدا بەو جۆرە رەفتاری نواندووە، کە لە هۆشیدا داپڕشتبوو. ئەو لەو ماوەیەدا چەندین سەرکەوتنی بەرچاوی بەدەستهێنا، بەجۆرێك، کە حکومەتی لو، ئیرەیی ویلایەتەکانی دراوسێی وروژاند.

له ماوەی پۆستداری کۆنفوشیۆسدا، ڕەفتار و مۆراڵی خەڵکی باشتر بوو بوو و پیاوان و ژنان، خانەدان و خۆپارێز و پاك بوون. خەڵکی لە شەقامەکاندا لە دوو لای جیاوازەوە هاتوچۆیان دەکرد، شتە گرانبەهاکانیان لە کەناری شەقامەکان دادەنا بێ ئەوەی لە دزینیان بترسن. شوانەکان، مەڕەکانیان بۆ تێراوکردن نەدەبرد، کە دەیانهێنان بۆ فرۆشتنیان لە بازاڕ بۆ ئەوەی بە قەڵەوی دەرکەون. ئەو گەشتیارانەی لە ویلایەتەکانی دیکەی چاینەوە، کە بۆ لو دەهاتن، یادەوەرییەکی ئاسوودەیان دەبوو(١٥).

**B. ڕیفۆرمی فۆرم و ناوونیشانەکان:** کۆنفوشیۆس باوەڕیی وابوو، کە گرنگترین هەنگاوی پراکتیکییانەی دەستەڵاتدارێکی شایستە، بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگایەکی هارمۆن و میانەڕەو، "ریفۆرمی فۆرم و ناوونیشانەکان"ـە[٥٢]. مەبەستی ئەو لە "ریفۆرمی فۆرم و ناوونیشانەکان" برێتی بوو لەوەی، کە هەر ناوونیشان بۆدانراوێك پێویستە بەپێی ناوونیشانەکەی ڕەفتاربنوێنێت و هەر ناوێك دەبێت بەپێی ناولێنراوییەکەی بێت.

کاتێك لە کۆنفوشیۆس پرسیار کرا، کە ئەو ببێتە فەرمانڕەوا و دەستەڵاتداری وڵاتێك، یەکەمین هەنگاوی چی دەبێت، ئەو وەڵامی دایەوە یەکەمین هەنگاوی برێتی دەبێت لە "ریفۆرمکردن لە ناوونیشانەکان"دا تا سەرەنجامەکەی، گوتاری دەستەڵاتدار لەتەك کرداری دابێت و قسەی ناڕوون نەڵێت (گوتارەکان، بەشی ١٣، ٣). جارێکیش، یەکێك لە کۆنفوشیۆسی پرسی لەبارەی شێوازی حکومەت، ئەو وەڵامی دایەوە: "فەرمانڕەوا دەبێت فەرمانڕەوا بێت، وەزیر دەبێت وەزیر بێت، باوك پێویستە باوك بێت و منداڵ گەرەکە منداڵ بێت". (گوتارەکان، بەشی ١٢، ١١). بە گوتنێکی دیکە، هەر ناوێك گوزارشتکردنە لە واتایەکی تایبەتی، کە جەوهەرەکە ئەو ناوە دەنوێنێت. کەواتە، پێویستە ناو لە هەر شتێك بنرێت، کە جەوهەری ئەو شتە نیشان بدات و پێویستە لە نێوان ناو و واقیعیەتدا، گونجاوی و هارمۆنی بوونی هەبێت.

---

٥٢- اصلاح عناوین

بازنەیەك پێویستە تەواو خڕ بێت و چوار گۆشە دەبێت تەواو چوار لا بێت. کەواتە، دەسته‌ڵاتدارێك پێویستە تەواوی تایبەتمەندێتییەکانی دەسته‌ڵاتداری هەبێت و بەپێی ئەرکە تایبەتییەکەی دەسته‌ڵاتدارێتی، کار بکات. ئەگەر دەسته‌ڵاتدارێك بەمجۆرە کار نەکات، ئەوا ئیدی دەسته‌ڵاتدار نییە، هەرچەندە هەموو خەڵکیش ئەو وەکو دەسته‌ڵاتدار و فەرمانڕەوا بزانن. کەواتە هەر کەسێکی ناوونیشانی کۆمەڵایەتی هەیە، دەبێت بەپێی ناوونیشانەکەی ڕەفتاربنوێنێت و تەواوی ئەرکەکانی پەیوەست بە ناوونیشانەکەی، بە شێوەیەکی باش جێبەجێ بکات و میر، میرانە و وەزیر، وەزیرانە کار بکات، بەمجۆرەی، کە دەبێت باوك، ڕۆڵی باوکایەتی ئەنجام بدات و منداڵیش گەرەکە ڕۆڵی منداڵییەکەی تەواو بکات[١٦].

## ٤- کۆنفوشیانیزمی ئایینی

لەبارەی کۆنفوشیانیزمی ئایینی (ڕێبازی کۆنفوشیۆس بە ڕەنگێکی ئایینییەوە)، دەبێت دوو مەودای کاتی لە یەکتری جیابکەینەوە:

**یەکەم:** ڕەهەندی ئایینی کۆنفوشیانیزم، لە ڕۆژگاری ژیانی کۆنفوشیۆس و لە ناوەرۆکی قسەکانی و فێرکارییەکانی خۆیدا.

**دووەم:** ڕەهەندی ئایینی کۆنفوشیانیزم، لە ڕۆژگاری دوای کۆنفوشیۆس و لە ناوەرۆکی قسەکانی و فێرکاری پەیڕەوانیدا.

### ٤-١ کۆنفوشیانیزمی ئایینی لە ڕۆژگاری ژیانی کۆنفوشیۆسدا

فێرگەی کۆنفوشیۆس لە بنەڕەتدا فێرگەیەکی مۆراڵی و پەروەردەییە -لە ڕەهەندە تاك و کۆییەکاندا- و هیچ بانگەشەیەکی لەبارەی کایەکانی ئایین و باوەڕییەکانی مێتافیزیکیی نییە و لەم ڕووەوە، سیستەمێکی بیروباوەڕیی تایبەتیشی نەخستۆتەڕوو. بەڵام ئەوەی لە فێرکارییەکانی کۆنفوشیۆسدا وەکو ڕەنگێکی ئایینی دەبینرێت، باوەڕبوونە بە هێزێکی یەزدانی بە ناوی "تیان" (ئاسمان) و "مینگ" (حوکمی ئاسمان)، کە ئەویش لە باوەڕییە کۆنەکانی چاینی دێرین وەرگیراوە.

لەبارەی گوتار و ڕەفتاری ئایینی خودی کۆنفوشیۆس، پێویستە بڵێین تا ئاستێك، کە گرنگی بە ئەنجامدانی ڕێورەسمی ئایینی بۆ پاراستنی داب و نەریتی پێشینان داوە، ئەوا لە

ئاقاری بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵ و باشترکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بووە، ستایشی ئەمجۆرە ڕێورەسمەی کردووە و تەنانەت بەشداریشی تێدا کردوون. بۆ نموونە جارێك یەکێك لە شاگردەکانی کۆنفوشیۆس لە ڕێورەسمی قوربانی مانگی تازەدا، پێشنیاری ئەوەی کردووە چاوپۆشی لە قوربانیکردنی مەڕ بکرێت، بەڵام ئەو ڕەزامەند نەبوو و گوتی: "تۆ مەڕت خۆشدەوێت و منیش ڕێورەسمم خۆشدەوێت". (گوتارەکان، بەشی ۳، ۱۷). ئەو بە گرنگییەوە بەشداری لە ڕێورەسمی قوربانیدا دەکرد و دەیگوت بەشدارینەکردن لە ڕێورەسمی قوربانیکردندا وەکو ئەوەیە مرۆڤ هەرگیز قوربانی نەکردبێت. (گوتارەکان، بەشی ۳، ۱۲)[17]. ئەو بەشداریدەکرد لە ڕێورەسمی یادکردنەوەی پێشینان و ڕێزێکی زۆری بۆ ئەم کارە دادەنا و بەوانیدیکەیشی دەگوت، کە ڕێزدابنێن بۆ بەڕێکردن و ناشتنی تەرمی دایك و باوك و ڕێوڕەسمی قوربانیکردن دوای مردنیان.

هەڵبەت کۆنفوشیۆس ئەگەر بینیبای ئەنجامدانی هەندێك لە ڕێورەسمەکان ئاراستەیەکی داناییانەی نییە و بەرژەوەندی لە ئەنجامدانەکەیدا نییە، ئەوا ئەنجامدانی ئەو ڕێورەسمەی سەرزەنشت دەکرد و خۆشی لە ئەنجامدانی هەندێك کار نە دەهات، وەکو ئومێدەواربوون بە چاکە و پاداشت. ڕۆژێك یەکێك لە شاگردەکانی کۆنفوشیۆس لە مامۆستاکەی پرسی، کە ئەرکی مرۆڤ بەرانبەر بە ڕۆحە مردووەکان چییە؟ ئەویش وەڵامی دایەوە: "تۆ ئێستا، کە ناتوانیت یارمەتی زیندووەکان بدەیت، ئەی چۆن دەتوانی یارمەتی ڕۆحە مردووەکان بدەیت؟". (گوتارەکان، بەشی ۱۱، ۱۱). ئەو دەیگوت مرۆڤ دەبێت سەرەتا ڕاستگۆیانە ئەرکی خۆی بەرانبەر بە مرۆڤە زیندووەکان بەجێبهێنێت و بەرانبەر بە ڕۆحە مردووەکان، بە ڕێزەوە یادیان بکاتەوە. ئەو ڕزگاربوونی مرۆڤی بە ئەنجامدانی هەندێك کاری خورافی دانەدەنا. ڕۆژێك کەسێك لە کۆنفوشیۆسی پرسی بۆچی "خوداوەندی خۆراك" ئەوەندە ڕێزیدەگیرێت و لای خەڵکی خۆشەویستە. ئەو بە توندی وەڵامی دایەوە: "ئەم کارە بێهوودەیە ئەگەر کەسێك بەپێچەوانەی ویستی ئاسمان ڕەفتاربنوێنێت بە پاڕانەوە، هیچ کارێك دروست نابێت". (گوتارەکان، بەشی ۳، ۱۳).

## ٤– کۆنفوشیانیزمی ئایینی لە رۆژگاری دوای کۆنفوشیۆس

فێرگەی کۆنفوشیۆس هەرچەندە بەهۆی هەبوونی رەنگێکی تۆخی مۆراڵی و پەروەردەیی، ئەوا بە سیستەمێکی مۆراڵی-پەروەردەیی دادەنرێت و بە سیستەمێکی ئایینی ئەژمار ناکرێت، بەڵام دوای کۆچیی دوایی کۆنفوشیۆس، هێدی هێدی بە درێژایی سەدەکان و سەردەمەکان رەنگێکی ئایینی بەبەردا کرا.

پنتێکی گرنگ، کە نابێت لە کۆنفوشیانیزمی ئایینیدا فەرامۆش بکرێت برێتییە لەوەی فێرگەکەی کۆنفوشیۆس زێتر بەهۆی فەرمانڕەوایان و دەستەڵاتدارانی چاینی، رەنگێکی ئایینی بەبەردا کرا و گۆڕانی بەسەردا هێنرا بۆ چەشنێك لە ئایین. هەڵبەت هۆکاری ئەمەش، دەبێت لە سەرنجی تایبەتی کۆنفوشیۆس بۆ حکومەت و رۆڵی دەستەڵاتدار لە دەستەبەرکردنی خۆشگوزەرانی خەڵکی، جەختکردنەوەی لەسەر رەچاوکردنی پەیوەندی فەرمانڕەوا و ژێرفەرمان و ئامۆژگاریشی بۆ فەرمانبەرێتی ژێرفەرمان (یان رەعیەت) بۆ دەستەڵاتدار، بۆی بگەڕێین. بەمجۆرەیە، کە فێرکارییەکانی کۆنفوشیۆسی وەها دەتوانێت پایەکانی حکومەتی دەستەڵاتداران قایمتر بکات، بۆیە دەستەڵاتداران سەرنجیان خستە سەری. بەم شرۆڤە کردنە، کۆنفوشیانیزمی ئایینی، بە جۆرێك لە ئایینی دەوڵەتی دادەنرێت.

لە کۆتاییەکانی سەدەی دووەمی بەر لە مەسیح، یەکێك لە دەستەڵاتدارانی زنجیرەی "هان"[53] رایگەیاند، کە دەبێت فێرکارییەکانی کۆنفوشیۆس بە خەڵکی بگوترێت و بەمجۆرە رێبازی کۆنفوشیۆسی بە فەرمی (یان رەسمی) ناسێنرا. دەستەڵاتدارانی دوای ئەویش، هەرچەندە خۆیشیان بودایست یان دائۆیست بوون، بەڵام رێزێکی زۆریان بۆ کۆنفوشیۆس دادەنا. لە سەدەی یەکەمی زایینیدا، پایەی کۆنفوشیۆس لە خاقانیش زێتر رۆیشت و کۆنفوشیۆس بوو بە خاوەنی نازناوی تایبەتی

53 - Han

و هێدی هێدی چەندین ئەفسانەیان سەبارەت بەو هۆنییەوە. بۆ نموونە، دەگێڕنەوە، کە لە شەوی لەدایکبوونی کۆنفوشیۆسدا، ئەژدیهایەك دەرکەوت، چەندین ئاوازی نەرمی دلڕفێن لە ئاسمانەوە دەبیسترا، بانگێکی ئاسمانی گوتی ویستی ئاسمان ویستوویەتی مرۆڤێکی پیرۆز لەدایکبێت و دانایی ئەو بەسەر جیهاندا بلاوببێتەوە. هەروەها گوتراوە لە رۆژی لەدایکبوونی کۆنفوشیۆسدا، گیانەوەرێکی تاکشاخ هاتۆتە سەر زەوی و لە کاتێکدا گوریسێکی لە قۆچی خۆی ئالاندبوو، لای دایکی ئەو بەدیار کەوت و قسەی لەتەکدا کرد. هێدی هێدی کۆنفوشیۆس پلەی سیفەتی یەزدانی پێدرا و دەستەلاتداری ئەوکات، پەرستگایەکی لەتەنیشت گۆڕەکەی ئەو دروستکرد، کە چەندین قوربانی و دیاری زۆری بۆ دەچوو. دەستەلاتداران، هەریەکە و بە نۆرەی خۆیان هەولی پیرۆزکردن و رێزبۆدانانی زێتری ئەویان دا و هەریەکە و هەولی دەدا لەم بوارەدا پێش دەستەلاتدارەکەی بەر لەخۆی بکەوێتەوە. بەمجۆرە بوو رێبازی کۆنفوشیۆس، فۆرمێکی ئایینی بەبەردا کرا و خەلکیش بەهۆی هاندانییان لەلایەن دەستەلاتدارانەوە، پێشوازیان لە رێبازیی بەئایینبووی کۆنفوشیۆسی کرد.

پرۆسەی گەشەکردن و بلاوبوونەوەی کۆنفوشیانیزمی ئایینی درێژەی هەبوو تا لە سەدەی حەوتەمی زایینیدا (سالی ٦٣٠ زایینی) یەکێك لە دەستەلاتدارانی زنجیرەی "تانگ"[٥٤] بڕیاریدا، کە لە هەر شارێکدا، پەرستگایەك بۆ کۆنفوشیۆس دروستبکرێت بۆ ئەوەی خەلکی لەو پرستگایەدا بە رێورەسمێکی تایبەتییەوە، رێزی بگرن و قوربانی بۆ بکەن. دوای ئەوە، چەندین تابلۆی گرانبەهای رازێنراوەیان بە ناوی کۆنفوشیۆس و داناکانی دیکەی ئەو کات لە پەرستگاکان دانا.

لە سەدەی هەشتەمی زایینیدا، بۆ دانانی لە بەرانبەر بودابیزم، یەکێك لە دەستەلاتدارەکان فەرمانی دەرکرد بۆ ئەوەی لە تەواوی پەرستگاکانی پەیوەست بە کۆنفوشیۆس، وێنەی ئەم دانایە و وێنەی ئەو دانایانەی پەیڕەویان لەو کردووە، دروست بکرێت. بەمجۆرە بوو پەرستگاکانی کۆنفوشیۆسی بە لاساییکردنەوەی

54 - Tang

پەرستگاکانی بودایی، لە رازاندنەوە و پێشکەشکردنی قوربانییەکان و دیارییەکان، رەونەقێکی زۆری بەدەستهێنا و هەر رۆژە داهێنانێکی تازە دەخرایە سەر داهێنانەکانی پێشووترەوە و کۆنفوشیانیزمی ئایینی زێتر لە پێشوو، دوور کەوتەوە لە فێرگە سەرەتاییەکەی کۆنفوشیۆس. دەستەلاتداران هەر ساڵەی لە دوو وەرزی بەهار و پاییزدا، بە شکۆ و مەزنێتییەکی زۆرەوە، رێگەی پایتەختیان دەگرتەبەر بۆ چوونە پەرستگای کۆنفوشیۆس و چەندین مانگا و مەڕی دابەستە و بەرازی قەڵەویان دەکردە قوربانی و چەندین رێورەسمی شکۆمەندییان بە سەما و گۆرانی گوتنەوە ئەنجام دەدا(١٨).

لە سەدەی شازدەیەمی زایینیدا (ساڵی ١٥٣٠ زایینی)، یەکێك لە فەرمانڕەوایانی زنجیرەی "مینگ"[55] بڕیاریدا رێورەسمی کۆنفوشیۆسی بە شێوەیەکی سادەتر ئەنجام بدرێت، نازناو و ئەو ناوونیشانانەی بە کۆنفوشیۆس درابوون لە رابوردوودا، رەتکرانەوە و وەلانران و لە جیاتی ناوونیشانی وەکو "مامۆستای دانا" یان "فێرکاری دانای دێرین" دانران، پەرستگاکان بە سادەییەوە کرانەوە، وێنەکانی کۆنفوشیۆس لە پەرستگاکان لێکرانەوە و چەندین تابلۆی سادە، رازێنراوە بە ناوی ئەو، جێگەی ئەوانی پێشوویان گرتەوە(١٩).

لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا، یەکێك لە فەرمانڕەوایانی زنجیرەی "مەنچو"[56] هەوڵیدا جارێکی دیکە گرنگی سیفەت-یەزدانیانەی کۆنفوشیۆس زیندوو بکاتەوە و لەپلەی ئاسمان دایبنێت. ئەو لە زیندووکردنەوەی کۆنفوشیۆسیدا، چەندین یاسای تایبەتی دانان. بەڵام ئەم تەگبیرانە کارا نەبوون و کارەکە جێبەجێ نەبوو و خەڵکی پێشوازیان لە زیندووکردنەوی کۆنفوشیانیزمی ئایینی بە شێوازی پێشوو نەکرد. سەرەنجام ئەم زنجیرەیە لەناوچوو و دوای ئەوەش لەتەك راگەیاندنی حکومەتی کۆماری

55 - Ming
56- Manchu

له ساڵی ۱۹۱۱دا، کۆنفوشیانیزمی ئایینی زێتر له پێشوو به فەرامۆشی سپێردرا و تەنها وەکو "دانا" و "مامۆستای مەزن" ناوی کۆنفوشیۆسیان دەهێنا.

سەرەنجام، لەتەك شۆڕشی کۆمۆنیستی و سەرکەوتنی له نزیکەی نیوەی سەدەی بیستەمدا، هەموو ئایینەکان، وەکو کۆنفوشیانیزمی ئایینی به نایاسایی دانران و زێتریش لەوە، کۆنفوشیۆس نەك وەکو "دانا" و "مامۆستای مەزن" نەناسرا، بەڵکو ئەو وەك کۆنەپەرستترین کەسێتی مێژووی چاینی ناسێندرا.

شیاوی بەیادهێنانەوەیە هەرچەندە بە درێژایی سەدەکان، فێرگەی کۆنفوشیۆس بە فێرگەیەکی ئایینی و خودی کۆنفوشیۆس وەکو کەسێتییەکی سیفەت-یەزدانی ناسێندراوە، بەڵام هەرگیز ئەم فێرگەیە لە روانگەی ئایینییەوە، بە پلەیەکی وەکو پلەی بوداییزم و دائۆییزم نەگەیشت و وەکو ئەو دوو فێرگەیە، نقووم نەبوو لە رێورەسمەکاندا و کۆنفوشیۆسیش لە پلەی سیفەت-یەزدانیدا، نەگەیشتە ئاستی بودا و لائۆتزە[۲۰]. هۆکاری ئەمەش، دەگەڕێتەوە بۆ جیهانبینییە تایبەتییەکانی ئەم فێرگەیە. لەبەر ئەوەی فێرگەی بودایی و دائۆیی، دوو فێرگەی تەواو ناخگەرا و بەهەندنەگرتنی کاروبارەکانی دنیا بوون و بە پێچەوانەوە، فێرگەکەی کۆنفوشیۆس زێتر فێرگەیەکی رواڵەتگەرا، کۆمەڵایەتی و هاندان بوو رووەو کاروباری کۆمەڵایەتی و سیاسیی. بەم هۆیەوە، فێرگەی بودا و دائۆ، شیاوێتییەکی باشتریان هەبوو بۆ بەئایینبوون و زێتر دەیانتوانی رازونیاز و ئەفسانەخوازی خەڵکی گشتی بهێننە ئاراوە و بەم هۆیەوەش، کەوتنە نێو کایەی گۆڕان و بەرەوپێشچوونی تازەوە.

## ٥- پەیڕەوانی کۆنفوشیانیزم

دوو دانا لە نێوان پەیڕەوان و راڤەکارانی فێرگەی کۆنفوشیۆس، لە هەمووان دیارترن: یەکەم، "مێنسیوس"، وەکو پەیڕەوێکارێکی ئایدیالیست، و دووەم، "سون زی"، وەکو پەیڕەوکارێکی ریالیست. ژیان و فێرکارییەکانی هەر یەکێکیان بە پوختی دەخەینەڕوو:

### ٥-١ مێنسیوسی[٥٧] ئایدیالیست

### ٥-١-١ ژیاننامەی مێنسیوس

مێنسیوس، ناوەکەی بە فەرەنسی بووەتە "مێنگ زی"[٥٨] "مامۆستای مێنگ".
مێنسیوس نزیکەی سەد ساڵ دوای کۆچی دوایی کۆنفوشیۆس، **٣٧٢**ی بەر لە مەسیح، لە ویلایەتی بچووکی "زۆ"[٥٩] هاتە جیهانەوە. لە تەمەنی سێ ساڵیدا بوو، کە باوکی کۆچی دوایی کرد و دایکی پەروەردە و فێرکردنی ئەوی لە ئەستۆ گرت.
مێنسیوس و دایکی لە نزیك گۆڕستانێکدا دەژیان، کە دایکی کاتێك زانی کوڕەکەی لە یاری لەتەك منداڵاندا، بەردەوام مژوولی گۆڕهەڵکەندن و بەخاکسپاردنەوەی

---

57- Mencius
58 -Meng Zi
59-Zou

مردووەکانە، بڕیاریدا شوێنی نیشتەجێبوونیان بگۆڕێت. ئەوان لە شوێنێکی نزیك بازاڕ نیشتەجێبوون، بەڵام دوای ماوەیەك، دایکی کاتێك بینی ئەمجارە کوڕەکەی خەریکی یاری دانوستان و ئاڵوگۆڕییە، دووبارە بڕیاریدا شوێنی نیشتەجێبوونیان بگۆڕێت. ئەوان لە نزیك خوێندنگەیەك نیشتەجێبوون، کە ئەم جارەیان مێنسیوس، سەرنجی خستە سەر کاری مامۆستایان و شاگردەکان و لێرە بەدوا خەریکی یاری شاگردی و مامۆستایەتی بوو. ئەم کارە بووە هۆی خۆشحاڵی دایکی و ئومێدەوار بوو کوڕەکەی لە ئاییندەدا دوای دەستەبەرکردنی زانست بکەوێت(٢١).

مێنسیوس دوای گەشەکردنێکی پێویست، خەریکی بەدەستهێنانی زانست بوو و بە پلەی مامۆستایەتی گەیشت. ئەو زۆر هۆگری فێرکارییەکانی کۆنفوشیۆس بوو و ئەوی کردە سەرمەشقی ژیانی خۆی. مێنسیوس ئەو کاتەی لە دەزگای حکومەتی "چی"[٦٠]دا پۆستی وەرگرت، کاتێك بینی دەستەڵاتداری ئەو هەرێمە لە چاکسازی کاروباری ناوچەکە، سەرنج ناخاتە سەر فێرکارییەکانی کۆنفوشیۆس، بە سەختی پەشۆکاو پۆستەکەی بەجێهێشت. دوای ئەوە، چەندین گەشتی کردن بۆ شارەکان و دەڤەری جیاواز و لە هەموو شوێنێکدا بانگهێشتی کارگێڕەکانی دەکرد بۆ فێربوونی ئامۆژگارییەکانی کۆنفوشیۆس. بەڵام ئەویش وەکو مامۆستاکەی کۆنفوشیۆس، لە پراکتیکدا لەم کار و هەوڵانەیدا هیچ دەرەنجامێکی سەرکەوتووانەی بەدەستنەهێنا. ئەو لە ساڵی **٣٠٧**ی بەر لە مەسیح، ڕۆیشتە ویلایەتی لو و لەوێدا لەتەك فێرکردن و پەروەردەکردنی گەنجان و بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە خەریکبوو. مێنسیوس لە ساڵی **٢٨٩**ی بەر لە مەسیح، لە تەمەنی هەشتا و چوار ساڵیدا کۆچی دوایی کرد(٢٢).

مێنسویس کتێبێکی بە ناوی خۆی هەیە، ***مێنسیوس یان مێنگ زی***، لە حەوت بەش پێکهاتووە، کە هەڵگری فێرکارییەکانی و گوتارەکانی ئەوە لەتەك دەستەڵاتداران و گفتوگۆکانییەتی لەتەك شاگردەکانیدا. هەر ئەم کتێبەیە، کە درەنگترێك وەکو یەکێك لە چوار کتێبەکەی کۆنفوشیۆس ئەژمار کرا.

---

60 - Qi

### ٢-١-٥ فێرکارییەکانی مێنسیوس

فێرکارییە تایبەتییەکانی مێنسیوس بریتین لە:

- **ڕەوشتی باش:** مێنسیوس باوەڕیی وایە مرۆڤ پاکڕەوشتە و ڕەوشت(یان سروشت)ی مرۆڤ، مەیلی چاکەی هەیە. بە گوتنێکی دیکە، مرۆڤ بە زگماك مەیلی بەلای ئەنجامدانی کاری چاك و هەبوونی سیفەتی پەسەنددا هەیە. ئەو بەم گریمانەیەی، کە مرۆڤ پاکڕەوشتە، مرۆڤ وەکو هەبووی "چوار فەزیلەتی زگماکی" دادەنێت[٢٣]، کە بریتین لە:

١- هەستکردن بە هاوخەمی و هاوئاواتی، کە سەرەتا و دەستپێکی مرۆڤایەتی یان "ژێن"ـە.

٢- هەستکردن بە شەرم و بێزاری، کە دەستپێکی میانەڕەوی یان "یی"ـە.

٣- هەستکردن بە خاکەڕایی و ڕووخۆشی، کە سەرەتا و دەستپێکی داب و نەریتەکان یان "لی"یە.

٥- هەستکردن بە جەختێتی و گومان، کە سەرەتا و دەستپێکی دانایی یان "جی"یە.

مێنسیوس دەڵێت: "ئەم چوار فەزیلەتە، لە نێوان هەموو مرۆڤەکاندا هاوبەشە و هەر یەکە لە هەستەکانی هاوخەمی و هاوئاواتی، شەرم و بێزاری، خاکەڕایی و ڕووخۆشی، و جەختێتی و گومان لە نێو پێکهاتەی هەموو مرۆڤەکاندا بوونی هەیە. بە گوتنێکی دیکە، هیچ یەکێك لە فەزیلەتەکانی مرۆڤایەتی، میانەڕەوی، داب و نەریت، و دانایی لە دەرەوەی پێکهاتەی مروڤدا نین، کە دواتر پەیدا بن، بەڵکو هەریەکێك لەوانە لە سەرەتاوە لەتەك پێکهاتەی مرۆڤدا ئاوێتە بووە، بەڵام ئاگایی مرۆڤ تووشی لەیادچوونەوە دەبێت و ئەم فەزیلەتانە فەرامۆش دەکات. لەم ڕووەوە، گوتراوە: شتێك بخوازی، بەدەستی دەهێنیت. فەرامۆشی بکەیت، لەدەستی دەدەیت". (مێنسیوس، بەشی ٦، ١، ٦)[٢٤].

مێنسیوس جەخت لەسەر پەیڕەویکردن لە زگماکییە یەکەمان دەکاتەوە و لەمبارەیەوە دەڵێت: "ئەو کەسەی هەستکردن بە هاوخەمی و هاوئاواتی نییە، ئەوا مرۆڤ نییە، ئەو کەسەی هەستکردن بە شەرم و بێزاری نییە، ئەوا مرۆڤ نییە، ئەو کەسەی هەستکردن بە خاکەڕایی و رووخۆشی نییە، ئەوا مرۆڤ نییە، و ئەو کەسەی هەستکردن بە جەختێتی و گومانی نییە، ئەوا مرۆڤ نییە. لەبەر ئەوەی هەموو مرۆڤەکان ئەم چوار فەزیلەتەیان لە جەوهەری خۆیاندا هەیە، بۆیە پێویستە ئەوەیان لەیاد بێت، کە چۆن ئەو فەزیلەتانە پەروەردە بکەن و بە تەواوێتییان بگەیەنن. دەرەنجامەکەی، وەکو ئاگرێکی بڵێسەدار و یان وەکو کانییەکی بە کوڵ وایە. بهێڵە ئەوانە بە راستی پەرەبسێنن و ئەو کات بتوانن هەمووان لە نێو دەریا چوارییەکانی جیهان بپارێزن. ئەگەر ئەوانە پەرەنەسێنن، مرۆڤەکان تەنانەت ناتوانن خزمەتی دایك و باوکی خۆیشیان بکەن". (مێنسیوس، بەشی ٢، ١، ٦).

مێنسیوس هۆی پاکڕەوشتی مرۆڤ، بە هەبوونی هەستە چاکەکان دادەنێت، کە لە جەوهەری هەموو مرۆڤەکاندا هەیە و نیشانەی ئەوانە بۆ هەمووان شیاوی بینین و لێتێگەیشتنە. ئەو بۆ روونکردنەوەی بابەتەکە، ئەمجۆرە نموونەیە دەهێنێتەوە: ئەگەر چەند کەسێك لە ناکاو ببینن منداڵێك کەوتۆتە نێو چاڵێکەوە، دەترسێن و خەمبار دەبن و یەکڕاست هەوڵی رزگارکردنی منداڵەکە دەدەن، بێ ئەوەی چاوەڕوانی سوپاسکردن و پاداشتکردن بن لە لایەن دایك و باوکی منداڵەکە و یان چاوەڕوانی پێداهەڵگوتنی خەڵکی بن. (مێنسیوس، بەشی ٢، ١، ٦). کەواتە، ئەگەر کەسێك پێچەوانەی ئەمە رەفتاربنوێنێت، ئەوا هەستکردنی هاوخەمی و هاوئاواتی، شەرم و بێزاری، خاکەڕایی و رووخۆشی و، جەختێتی و گومانی نەماوە و لە مرۆڤایەتی خراوە.

مێنسیوس دەڵێت ئەگەر کەسانێك دەبینن خوو و نەریتی مرۆییان نییە، ئەوا بەم هۆیەوە نییە، کە لەسەرەتادا ئەم هەستە مرۆییەیان نەبووە، بەڵکو بەهۆی فەرامۆشکردنی ئەم هەستەیە، کە لە دەستیانداوە. ئەو نموونەیەك دەهێنێتەوە و تێیدا مرۆڤی پاکڕەوشت بە چیایەکی سەوز و جوان دەچوێنێت و دەڵێت: ئەگەر

چیایەك بەهۆی باران بارین و تیشكی خۆرەوە گەشاوە و سەوزەڵان بووە، كاتێك ببێتە لەوەڕگای ئاژەڵان و باڵندەكان، دوای ماوەیەك دەبێتە چیایەكی وشك و رووتەڵان. خەڵكی كاتێك ئەم چیایە دەبینن وا دەزانن هەرگیز سەوزەڵان نەبووە، لە كاتێكدا سروشتە سەرەتاییەكەی بەجۆرە نەبووە. مرۆڤیش بە زگماك چاكە و ئەگەریش ئەو بەجۆرە نییە، ئەوا بەهۆی ئەوەیە، كە چوار هەستە زگماكییەكەی خۆی لەدەستداوە، وەكو ئەو چیایەی سەوزەڵانییەكەی نەماوە. كەواتە، ئەگەر رەوتی فەرامۆشكردنی چوار هەستە زگماكییەكە لە لایەن مرۆڤەوە درێژەی هەبێت، ئەوا خوویەكی ئاژەڵی وەردەگرێت و جیاوازییەكی ئەوتۆی لەتەك ئاژەڵاندا نابێت. (مێنسیوس، بەشی ٦، ١، ٨).

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا: "ئەگەر هەمووان خاوەنی زگماكییەكەی باشن، ئەی بۆچی لە روانگەی مۆراڵپاكییەوە یەكجۆر نین؟" مێنسیوس دەڵێت: ئەمە بەهۆی كاریگەری ژینگە و هەلومەرجەكانە لەسەر مرۆڤ، نەك بەهۆی ئەوەی جەوهەری مرۆڤەكان جیاواز بێت (مێنسیوس، بەشی ٦، ١، ٨). ژینگە و پەروەردە لە منداڵییەوە كاریگەرییەكی زۆر لەسەر مرۆڤ دادەنێن. ژینگە و پەروەردەی خراپ، مرۆڤ دووچاری فەرامۆشكردنی چوار فەزیلەتە زگماكییەكە دەكات و ژینگە و پەروەردەی باش، دەبنە هۆی گەشەكردنی ئەم فەزیلەتانە. بەم هۆیەوە بوو، كە مێنسیوس جەختی لەسەر پەروەردە دەكردەوە و ئەوەی بە یەكێك لە فاكتەرە هەرە گرنگەكان دەزانی بۆ مرۆڤ[٢٥].

گرنگترین رێكارنامە (دستورالعمل)ی مێنسیوس بۆ فێركاری مۆراڵی بریتییە لەوەی مرۆڤ دەبێت چوار فەزیلەتەكە لە خۆیدا پەروەردە بكات و بە تەواوێتییان بگەیەنێت. لەم بارەیەوە دەڵێت: جێی داخە كاتێك مرۆڤەكان مریشك و سەگەكانی خۆیان بزر دەكەن، دەزانن پێویستدەكات بەدوایاندا بگەڕێن، بەڵام كاتێك دڵی خۆیان لەدەست دەدەن، هەرگیز بە نیاز نین بەدوایدا بگەڕێن. بە تێڕوانینی ئەو، مەبەست لە

فێرکاری، گەڕانە بەدوای دڵی[61] بزر بوو و لەدەستچوو و بەرزترین ئەرکی مرۆڤ ئەوەیە، ئەگەر دڵی خۆی لەدەستدا، دەبێت سەرەتا دڵی خۆی بەدەستبهێنێتەوە و بگەڕێتەوە بۆ جەوهەرە سەرەتاییەکەی و هەوڵی پەروەردەکردن و بەرەوپێشبردنی بدات. (مێنسیوس، بەشی ٦، ١، ١١).

مێنسیوس بۆ پەرەپێدانی فەزیلەتەکان رایدەگەیەنێت، کە مرۆڤ سەرەتا دەبێت بە فەزیلەتەکان بڕازێتەوە و پاشان هەوڵی بڵاوکردنەوە و پەرەپێدانیان بدات. بۆ نموونە، مرۆڤ لە قۆناغی یەکەمدا، دەبێت لەتەك بەساڵاچووەکانی خێزانەکەیدا، رەفتارێکی شایستەی هەبێت و لە قۆناغی دووەمدا، ئەم رەفتارە بەرانبەر بە خێزانەکانی دیکەیش بنوێنێت. (مێنسیوس، بەشی ٦، ١، ١٦)

- **حکومەتی باش:** بە تێڕوانینی مێنسیوس، حکومەتی باش ئەو حکومەتەیە، کە دەستەڵاتدار (یان سەروەرەکەی) بەر لەوەی بەم پۆستە گەیشتبێت، لە سایەی پەیڕەویکردن لە زگماکە چاکەکانی مرۆیی، بە حکومەت گەیشتبێت و دانایی بەدەستهێنابێت و دوای گەیشتن بە حکومەت، لەتەك دابینکردنی گوزەرانی خەڵکی و پەروەردەکردنیان، بە دڵسۆزییەوە خۆشگوزەرانیان بۆ دابین بکات بۆ ئەوەی ئەوانیش پارێزەری گیان و دڵی حکومەت بن. کەواتە حکومەتی باش، حکومەتی خەڵکییە.

بە تێڕوانینی مێنسیوس، بە شێوەیەکی گشتی دەشێت دوو جۆر حکومەت[(٢٦)] بوونی هەبێت(مێنسیوس، بەشی ٢، ١، ٣):

١- **حکومەتی وانگ**[62] یان **حکومەتی داناییانە:** حکومەتێکە بەهۆی فەزیلەت، دابینکردنی گوزەرانی خەڵکی و پەروەردەکرنیان بەڕێوە دەچێت.

٢- **حکومەتی با**[63] یان **حکومەتی ستمەکارانە:** حکومەتێکە بەهۆی دیکتاتۆری، ستەم و زۆرداریییەوە بەڕێوە دەچێت.

---

٦١ - لێرەدا بە واتای جەوهەر دێت، وەرگێڕ

62–Wang

63-Ba

مێنسیوس دەڵێت: "کەسێك لە جیاتی کارڕاستی، زۆرداری بەکاربهێنێت ئەوا بە "با" دادەنرێت، کەسێك بە دانایی، و مرۆڤدۆستییەوە کار بکات، ئەوا بە "وانگ" دادەنرێت. کاتێك کەسێك خەڵکی کردە ملکەچی خۆی بەهۆی فشار و زۆردارییەوە، ئەوا ملکەچبوونی خەڵکی بۆ ئەو تەنها رواڵەتییانەیە و ناخەکییانە نییە، چونکە ئەوان توانستێکی باشیان نییە بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو. بەڵام کاتێك کەسێك بە دانایی و دڵسۆزییەوە خەڵکی بەلای خۆیدا رابکێشێت، ئەوان لە ناخیشەوە گوێڕایەڵی دەبن و خۆیان وەها دەدەنە دەست حکومەت، کە وەك ئەو حەفتا شاگردەی کۆنفوشیۆس، خۆیان دایە دەستی ئەو". (مێنسیوس، بەشی ٢، ١، ٣). "فەرمانڕەوایانی رۆژگاری دێرینیش، دڵێکی میهرەبانیان هەبوو، کە بەرگەی دەرد و ئازاری خەڵکیان نەدەگرت و حکومەتی ئەوان هەرگیز ستەمکار نەبوو بەرانبەر بە خەڵکی. بەجۆرە بوو، کە فەرمانڕەوایی بۆ ئەوان هێندە ئاسان بوو وەکو هەڵسوڕاندنی شتێك لە نێو لەپی دەستدا". (مێنسیوس، بەشی ٢، ١، ٦).

بە باوەڕی مێنسیوس هەر وڵاتێك سێ پایەی هەیە: "گرنگترین پایەی خەڵکە، پایەی دیکەی زەوی و دانەوێڵە و ناگرنگترینی پایەی فەرمانڕەوایە". (مێنسیوس، بەشی ٧، ٢، ١٤). خەڵکی سەرچاوەی حکومەتێکی شایستەن. حکومەت دەبێت لە خەڵکەوە سەرەتابگرێت تا بە فەرمانڕەوا بگات نەك ئەوەی لە فەرمانڕەواوە سەرەتابگرێت و پاشان بە خەڵکی بگات. خەڵکی هۆکاری مانەوەی حکومەتێکی شایستەن. ئەگەر فەرمانڕەوایەك تایبەتمەندیی پێویستی نەبێت، ئەوا خەڵکی مافی خۆیانە لەسەرکاری لابەرن، لەبەر ئەوەی وەها دەستەڵاتدار و فەرمانڕەوایەك (کە تایبەتمەندییە پێویستەکانی نییە) لە راستیدا فەرمانڕەوا نییە و بەڵکو تاکێکی ئاساییە. (مێنسیوس، بەشی ١، ٢، ١٠)[٢٧].

مێنسیوس دوو ئەرك (ئاسایشی خەڵکی و پەروەردەکردنی خەڵکی) بۆ دەستەڵاتدار و فەرمانڕەوا دیاریدەکات و راڤەیان دەکات:

**١- ئاسایش و خۆشگوزەرانی:** حکومەت دەبێت بە چەندین پلانی پێویست

گوزەرانی خەڵکی دابینبکات و ببێتە هۆکاری باشبوونی ژیانیان بۆ ئەوەی خەڵکی لە ژیانی ئاسایی و ڕۆژانەی خۆیاندا دووچاری تەنگانە نەیەن و خۆراك و پۆشاکی پێویستیان هەبێت. پلانەکانی حکومەت دەبێت لە بوارەکانی گەشەپێدانی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری، دابینکردنی داهاتی پێویست و ڕێگرتن لە جەنگ و خوێنڕشتن، بێت.

٢- **پەروەردە و فێرکردن:** حکومەت دەبێت زەمینە بۆ پەروەردە و فێرکردنی خەڵکی بڕەخسێنێت بۆ ئەوەی ئەوان بتوانن بە فێرکارییە مۆراڵییەکانی خۆیان، لە ئەنجامدانی ئەرکی نیشتمانی و گێڕانی ڕۆڵی کۆمەڵایەتییان، لێهاتووییەکی پێویستییان هەبێت. ئەو خەڵکانەی کێشەی خۆراك و پۆشاکیان نەبێت و بە ئاسوودەیی بژین، بەڵام بێبەش بن لە پەروەردەکردنێکی باش، ئەوا لە باڵندە و ئاژەڵان نزیکترن نەك لە مرۆڤ. حکومەت ناتوانێت بە ترس و توندوتیژی سەرنجی خەڵکی بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، بەڵام دەتوانێت بە پەروەردەکردنی باشی خەڵکی، دڵیان بەدەست بهێنێت و بیانکاتە پارێزەری خۆی.

- **خۆناسی:** مێنسیوس بە تێڕوانینێکی عیرفانیانە باوەڕیی وایە، کە ناخی مرۆڤ ئەوەندە مەزنە و هەموو شتێکی لەخۆیدا هەڵگرتووە و هیچ شتێك هێندەی تێگەیشتن لێی چێژبەخش نییە. مرۆڤ دەبێت هەوڵ بدات خۆی بناسێت و ڕێگەی خۆناسیش بەکارهێنانی "جۆنگ و شو"ـە. بە گوتنێکی دیکە، مرۆڤ بەڕێی مۆراڵپاکییەوە دەتوانێت بەم خۆناسییە بگات. لەم شێوەیەدا، مرۆڤ نەتەنها "ئاسمان" (خوداوەند) دەناسێت، بەڵکو دەتوانێت لەتەك ئەودا بە یەکێتی بگات و ببێت بە یەك. لەبەر ئەوەی مرۆڤ بە بەکارهێنانی "جۆنگ و شو" خۆپەرستی خۆی کەم و کەمتر دەکاتەوە تا شوێنێك، کە ئیدی هیچ جیاوازییەك لە نێوان خۆیی و ئەوانیدیکەدا نابینێت، و لەمەش زێتر، تێدەگات جیاوازی لە نێوان ئەو و جیهانی بووندا نییە و ئەو لەتەك بوونەوەرانی جیهان بووە بە یەك و هەموو شتێك لە ناخی خۆیدایەتی[٢٩]. کەواتە، بۆ ناسینی بوون دەبێت خۆ بناسین و نە بەپێچەوانەوە، لەبەر ئەوەی "خۆ" دەلاقەیەکە بۆ ناسینی بوون. بە مانایەکی

دی، مرۆڤ بە خۆناسی (ناسینی هێزی ناخەکی) بە خوداناسی (ناسینی ئاسمان) دەگات (مێنسیوس، بەشی ٧، ١، ١). لەبەر ئەوەی "هەر شتێك لە ئاستی بەرزدا، لە نێو ناخی مرۆڤدا هەیە". (مێنسیوس، بەشی ٧، ١، ٤).

مێنسیوس بە واژەی "چی" یان "هێزی ژیان" گوزارشت لە جەوهەری مرۆڤ دەکات، کە بوونەوەرێکی هەرمانی بەهێز و هەرمانی مەزنە و نێوانی زەوی و ئاسمانی پڕکردووە و مرۆڤ بەبێ ئەوە، هیچ شتێکی نییە. (مێنسیوس، بەشی ٢، ١، ٢). ئەو باوەڕی وابوو مرۆڤ لەتەك لابردنی ڕێگرەکانی بەردەم گەیشتن بە مەزنێتی خۆی، بۆ خۆناسی، ئەوا دەبێت ئەم هێزە سەرسوڕهێنەر و جەوهەرە بناسێت و لەتەك تێگەیشتنیدا، بە فەرمانڕەوایی بەسەر ئەو شتەی لە نێوان زەوی و ئاسماندایە، بگات(٣٠).

## ٢–٥ سون زی٦٤ی ریالیست

### ١-٢-٥ ژیاننامەی سون زی

ناوی سەرەکی سون زی، "کوانگ"٦٥ و نازناوەکەی "سەن چینگ"٦٦ـە. سون زی، ماوەیەك بەر لە مردنی مێنسیوس و لە دەوروبەری ساڵی ٢٩٨ی بەر لە مەسیح هاتە جیهانەوە. سون زی گەنجێتی خۆی لە ویلایەتی "یین"٦٧ بەسەربرد. ئەو تا تەمەنی پەنجا ساڵی کاتەکانی خۆی تەرخانکرد بۆ لێکۆڵینەوە و وانەگوتنەوە تا ئەو کاتەی بانگهێشتی ویلایەتی "چی" کرا و دەزگای حکومی ئەو ویلایەتە، ڕێزێکی زۆری بۆ پێگەکەی ئەو دانا و فێرکارییەکانی بەرزنرخاند و بەرپرسیارێتییەکیشی پێبەخشرا، بەڵام بەهۆی ئیرەیی و چاوچنۆکی خراپەکاران، مەیدانەکە بۆ ئەو بەرتەسك

---

64- Xun Zi

65- Kuang

66 –Xun Qing

67 –Yen

و تەنگ بۆوە تا وای لێهات ئەو پۆستەکەی بەجێهێشت و ڕێگەی ویلایەتی "چو"[٦٨]ی گرتەبەر. سون زی بەهۆی وەزیری باڵای چو، پۆستی سەرۆکی دادگای باڵای پێبەخشرا، بەڵام دوای ماوەیەك ئەم پۆستەشی بەجێهێشت و خەریکی پەروەردەکردنی فێرخوازان بوو، کە هەندێك لە شاگردەکانی درەنگترین بوونە ناودارەکانی مێژووی چاین. سون زی ماوەی تەمەنی خۆی تەرخانکرد بۆ لێکۆڵینەوە و نووسین و سەرەنجام لە ساڵی ٢٣٨ی بەر لە مەسیح کۆچی دوایی کرد[٣١].

کۆمەڵە فێرکارییەکانی سون زی، لە کتێبێکدا بە ناوی خۆی، ***سون زی*** کۆکراوەتەوە. ئەم کتێبە لە سەرەتادا برێتی بوو لە سێسەد و بیست و دوو بەش، بەڵام درەنگترێك بەو پوختکردنەوەی تێیدا کرا، بوو بە سی و دوو بەش.

## ٢-٢-٥ فێرکارییەکانی سون زی

**دەتوانین فێرکارییەکانی سون زی بەمجۆرە پۆلێن بکەین:**

- **ڕەوشتی خراپ:** سون زی-بەپێچەوانەی مێنسیوس- باوەڕیی وایە مرۆڤ خراپڕەوشتە و ڕەوشتی ئەو مەیلی بەلای خراپەدا هەیە (سون زی، بەشی **٣٢**). ئەو دەڵێت ئاسمان ئەم ڕەوشتەی سەرەتا بە مرۆڤ داوە و مرۆڤ لە هەڵبژاردنیدا هیچ ڕۆڵێکی نەبووە و ڕەوشتی یەکەم (یان سەرەتا) شیاوی فێرکردن و بەدەستهێنان نییە. کەواتە، ئەوەی چاو بتوانێت بیبینێت و گوێ بتوانێت بیبیستێت ڕەوشتی مرۆڤە، هەرچی بشێت ببینرێت ئەوا پەیوەستە بە چاو و هەرچی بشێت ببیسترێت ئەوا پەیوەستە بە گوێوە، کەواتە ئەوەی چاو دەیبینێت فێرکردن نییە و ئەمەی گوێ دەیبیستێت فێرکردن نییە. بە تێڕوانینی سون زی، ڕاستە مرۆڤ خراپڕەوشتە و لەم ڕەوشتە یەکەمەیدا هەڵبژاردنی نەبووە، بەڵام ئەمە کۆتایی ڕێگەی مرۆڤ نییە، بەڵکو مرۆڤ بەهۆی پەروەردەبوون (بەرهەمی پەیڕەویکردن لە لی)، کە کارێکی دەستەبەریی و هەڵبژێردراوییە، دەتوانێت مۆراڵپاك بێت و خۆی بگەیەنێتە لوتکەی

---

68 - Chu

مرۆڤایەتی. (سون زی، بەشی ٣٢). کەواتە، هەم زگماکی یەکەم و هەم پەروەردەی دووەم زەرورەتی هەیە، لەبەر ئەوەی لە لایەکەوە، ئەگەر زگماکی و رەوشتی یەکەم نەبایە، ئەوا شتێك بوونی نەدەبوو بە ناوی بابەتی پەروەردەکردن و هاوکات پەروەردەکردن لە بەرانبەری بووەستێت، لە لایەکی دیکەوە، ئەگەر پەروەردەکردن نەبایە بۆ ئەوەی زگماکی یەکەمی خراپ بگۆڕێت، ئەوا زگماکی یەکەم نەیدەتوانی لەخۆیدا، جوان و باڵا بێت(٣٢).

سون زی لە روونکردنەوەی ئەم بابەتەدا دەڵێت مرۆڤەکان بەپێی سروشت (یان رەوشت)ی خۆیان، هەوڵی سوودخوازیی دەدەن، شەڕانگێز و چاوچنۆکن، توندوتیژی ئەنجام دەدەن و چاولەدەرن، بەڵام ئەم رەوشتە خراپانە بەهۆی پەروەردەکردنەوە، دەبن بە رەوشتێکی باش. وەکو ئەوەی تەختەیەکی خوار بخەیتە ژێر هەڵمەوە تا وایلێبکەیت لار ببێتەوە و پاشان راست بێتەوە، و دەبێت کانزای کولیش وەها بکوترێت بۆ ئەوەی تیژ ببێت(٣٣). لەم رووەوە، مرۆڤ نابێت لە پەروەردەکردنی خۆی دوابکەوێت، بەڵکو دەبێت لای مامۆستایانی لێهاتوو ببێتە فێرخواز، لەتەك هاوڕێی باشدا هەڵسوکەوت بکات. هونەر و فەزیلەت لە مامۆستایانی شایستە فێرببێت و لە هاوڕێ باشەکانیشی، فێری وەفاداری، دەستپاکی، رێزداری و پاکدامێنی، ببێت.

سون زی سەرباری باوەڕبوونی بە خراپڕەوشتی مرۆڤ، بەڵام باوەڕییشی بە مەزنێتییەکی تایبەتی هەیە بۆ مرۆڤ. لەبەر ئەوەی بە تێڕوانینی ئەو، مرۆڤ سەرباری ئەوەی خراپڕەوشتە، ئەوا ئەم توانستە زگماکییەشی هەیە، کە بەهۆی هەوڵدان بۆ پەروەردەکردنی خۆی، بەپێچەوانەی رەوشتی یەکەمینی خۆی هەڵسوکەوت بکات و لەتەك پەروەردەکردنی خۆیدا، رەوشتی سەرەتایی خۆی بگۆڕێت و خۆی بە سیفاتی باش و پەسەند بڕازێنێتەوە و ئەم کارەش، تەنها بۆ مرۆڤ شیاوە(٣٤). لەم رووەوەیە سون زی دەڵێت مرۆڤ بە ئەندازەی ئاسمان و زەوی بەهای هەیە: "ئاسمان چەندین وەرزی تایبەت بەخۆی، زەوی چەندین سەرچاوەی تایبەت بەخۆی و مرۆڤ کەسێتی و رەوشتی [بەهۆی پەروەردەوەی] تایبەت بەخۆی هەیە و ئەمەیە مانای ئەوەی دەگوترێت مرۆڤ توانستی ئەوەی هەیە یەکێتی لەتەك [ئاسمان و زەویدا] پێکبهێنێت". (سون زی،

بەشی ١٧). بە تێڕوانینی سون زی، مرۆڤ بە شێوەیەك دروستکراوە، کە دەتوانێت دوو جۆر رەفتاری خۆی بخاتەڕوو، یەکێکیان رەفتاری سادە، کە سروشتییە و ئەویدیکە رەفتاری ئاڵۆز، کە بەدەستهاتوو و بەرهەمی پەروەردەیە.

- **زەروورەتی لی:** سون زی، رەچاوکردنی لی بە گەرەنتی خۆشگوزەرانی خەڵکی و کۆمەڵگا دادەنێت. بە شێوەیەکی پوخت، شرۆڤەی سون زی بۆ زەروورەتی لی (کۆمەڵە رێسا و داب و نەریتێکی مۆراڵین لەبارەی تاك و کۆمەڵ) — کە دەشێت هەم بنە هۆی پەروەردەکردنی خەڵکی لە رەهەندی کۆمەڵایەتییەوە و هەم ببنە هۆی پاککردنەوەی دەروون لە رەهەندی تاکێتییەوە — برێتییە لە:

**یەکەم:** مرۆڤ لە لایەکەوە، لەبەر ئەوەی بە زگماك خراپ و هەڵگری غەریزەی سەرکەشانەیە، ئەوا مەیلی بەلای خراپی و شەڕانگێزییەکاندایە و دەبێتە بوونەوەرێکی خۆپەرست و زێدەڕۆ و ئەمەش دەبێتە هۆی گرژی و ئاڵۆزی ئەو لەتەك ئەوانیدیکەدا.

**دووەم:** مرۆڤ لە لایەکی دیکەوە، هەم بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی و هەم بوونەوەرێکی کولتوورییە:

- **کۆمەڵایەتیبوون:** مرۆڤ بە دوو هۆ زەروورییە: یەکێکیان بە هۆی دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی خۆی بۆ ژیانی رۆژانە و ئەویدیکە بەهۆی دروستکردنی یەکێتیی بۆ سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا. (سون زی، بەشی ١٠).

- **کولتوورییبوون:** مرۆڤیش بەپێی ویستی خۆی خوازیاری مرۆڤبوونە، چونکە مرۆڤ بەهۆی ئەوەی خاوەنی دوو پێستی داپۆشراو بە موو نییە، بۆیە ناشێت بە شێوەیەکی راستەقینە بە مرۆڤ دابنرێت، بەڵکو بە ویستی مرۆڤبوونی خۆی، پێویستە تایبەتمەندییەکی دیکەیشی هەبێت، ئەویش برێتییە لە هەبوونی پەیوەندی شایستە و مرۆیی لەتەك مرۆڤەکانی دیکەدا. (سون زی، بەشی ٥).

لە هەردوو شێوەکەدا (کۆمەڵایەتیبوون و کولتوورییبوون)، مرۆڤ چەندین رێسای پێویستە، چونکە ئەو بوونەوەرێکی زێدەڕۆ و هەڵگری چەندین غەریزەی سەرکەشانەیە، بۆ ئەوەی بەهۆی ئەو رێسایانەوە بتوانێت بە شێوەیەکی ئاشتییانە و

بەبێ شەڕانگێزی و ئاژاوە لەتەك مرۆڤەكانی دیكەدا هەڵبكات و ئەم ڕێسایانەش، هەمان "لی"یە. كەواتە بە شێوەیەكی پوخت، مرۆڤ بە كۆنترۆڵكردنی غەریزەكانی خۆی، ناچارە پەیوەست بێت بە "لی"یەوە[٣٥].

هەڵبەت سون زی بۆ باشبوونی مرۆڤ، سەرباری لی، هاوكات چەند فاكتەرێكی دیكەیش وەكو مۆسیقا و ویژدان (دڵ) پێشنیار دەكات، بەم هۆیەی، كە: لی غەریزەكانی مرۆڤ دیسپلین دەكات، مۆسیقا غەریزەكان جوان و ناسك دەكات و ویژدانیش غەریزەكان دەگۆڕێت و بە عەقڵەوە گرێیدەدات[٣٦].

شیاوی بەیادهێنانەوەیە، كە جێبەجێكردنی "لی" لە ڕەهەندە كۆمەڵایەتییەكەیدا، گەرەنتی جێبەجێكردنێكی دیكەیش دەخوازێت، ئەویش هەبوونی حكومەت و دەستەڵاتدارە. مەبەست لە سیاسەت بەپێی بنەماكانی سون زی، دیسپلینكردنی غەریزەكانی مرۆڤە لە كۆمەڵگادا و هاوكات سوودمەندبوونێكی شایستەیشە لە غەریزەكان. بەپێی ئەم شرۆڤەكردنە، بەرپرسی دیسپلینكردنی غەریزەكان، دەستەڵاتدار و فەرمانڕەوای كۆمەڵگایە و ئامرازی ئەویش بۆ جێبەجێكردن، تەنها "لی"یە بۆ ئەوەی پەیوەندی مرۆڤەكان لەتەك یەكدیدا بەشێوەیەكی باش بێتە ئاراوە و هەركەسەش لە شوێنی تایبەتمەند بەخۆی بێت، گەورەكان لە شوێنی خۆیان و بچووكەكانیش لە شوێنی خۆیاندا بن.

- **ئەپستمۆلۆژی (یان تیۆریی زانین):** سون زی باوەڕیی وایە هەر دیاردەیەك (فێنۆمێنێك) خاوەنی "بوون" و "دیمەن"ێكە، كە تەنها یەكێك لەو دیمەنانەی فێنۆمێن، حەقیقەتی هەیە و یەكسانە لەتەك بوونەكەیدا و تەواوی دیمەنەكانی دیكە جگە لە سەراب و فریودانێك، شتێكی دیكە نین. (سون زی، بەشی ٢٢). مرۆڤ تا ئەو كاتەی گرفتاری غەریزەكانییەتی و نەگەیشتووەتە پاكێتی ناخی، ئەوا گرفتاری ئەم سەراب و فریودانەیە. بۆ نموونە، كەسێك لە مەودایەكی دووردا، مێزێك ببینێت، وا دەزانێت بەردە، كەسێكی مەست (چونكە مەی هۆشی ئەوی ئاڵۆز كردووە) لە دەروازەی شارەوە وەها بە لارەلار دەڕوات، وەك بڵێی خەریكە دەچێتە ژوورەكەیەوە[٣٧].

به تێڕوانینی سون زی، توانستی زانین، پێکهاتووه له دوو بەش: یەکێکییان "ئۆرگانە ئاسمانییەکان"- کە بریتییە لە چاو و گوێ- و ئەویدیکە گیان (دڵ)ـە. (سون زی، بەشی ٢٢). ئۆرگانە ئاسمانییەکان لێکچوون و جیاوازییەکان نیشان دەدەن، سێنس[٦٩](یان مەغزا)ی بینین شێوەکان و رەنگە جۆراوجۆرەکان ریزبەند دەکات و سێنسی بیستن دەنگەکان و ئاوازەکان پۆلێنبەند دەکات، و بە گوتنێکی دیکە، فێنۆمێنە دەرەکییەکان کاریگەری لەسەر "ئۆرگانە ئاسمانییەکان" دادەنێن. گیان، ئەگەر بەهۆی غەریزە سەرکەشەکانەوە، تاریك و نەشێوێنرابێت، مانا بە کاریگەرییەکانی "ئۆرگانە ئاسمانییەکان" دەبەخشێت. کەواتە ئەگەر ئۆرگانە ئاسمانییەکان و گیان، بە دروستی کاربکەن، ئەوا مرۆڤ بە زانینی واقعی و ریاڵ دەگات. بە وردبوونەوە لەم شرۆڤەیە روون دەبێتەوە، کە بەپێی تێڕوانینی سون زی، زانست و زانین نازگماکی (یان دەستەبەرییە)[٣٨].

---

٦٩ - سێنس لە کوردیدا هەستی بۆ دانراوە، کە هەڵەیە، چونکە دەرککردنی سێنسی پەیوەستە بە پێنج ئۆرگانە فزیۆلۆژییەکەوە، کە بریتین لە: (بینین، بۆنکردن، چەشتن، بیستن، دەستلێدان)، بەڵام هەستکردن، دەرککردنێکی سایکۆلۆژیانەیە و بۆ نموونە هەستکردن بە ترس. لە زمانی ئینگلیزیدا بۆ وشەی سێنس Sense و بۆ وشەی هەست Feeling دانراوە. هاوکات لە عەرەبیشدا (حس) بۆ سێنس و (شعور) بۆ هەست بەکاردەهێنرێت. (وەرگێڕ)

## ٦-فێرگە نەیارەکانی کۆنفوشیانیزم

لە نێوان ئەو فێرگە گرنگانەی نەیاری کۆنفوشیانیزم بوون و هاوکات کەوتوونەتە رەخنەگرتن لێی، دەتوانین ئاماژە بە چوار فێرگە بکەین، کە برێتین لە: **بودابیزم، دائۆییزم، مۆییزم** و **فاییزم:**

### ٦-١ فێرگەی بودا

بودابیزم سەرباری نانیشتمانی بوونی، لە چاین هەژموون و کاریگەری پەیداکرد و پەرەی پێدرا و هاوکات مەیدانەکەی بۆ گەشەکردنی کۆنفوشیانیزم بەرتەسك کردەوە. لەوانەیە یەکێك لە هۆکارەکانی گەشەکردنی بودابیزم، ناخگەراییەکەی بێت لە بەرانبەر روالّەتگەراییەکەی کۆنفوشیانیزمدا. بەم واتایە ناخگەرایی بودابیزم زۆر ئارامبەخش بووبێت، بۆ ئەو کەسانەی، کە لە داب و نەریت و رێورەسمە وشك و دەمارگرژییەکەی کۆنفوشیانیزم (کە حکومەتەکان بۆیان داتاشیبوون) بێ هیوا بووبون و لە گەڕان بەدوای مانادا بەجێمابوون. هۆکارێکی دیکەی گەشەکردنی بودابیزم برێتی بوو لەوەی کۆنفوشیانیزم بەهۆی بەرگرییە سەرسەختەکەی لە حکومەت، ئەمە بوو بوو بە دەسوێژێك بۆ دەستەلاّتداران و حکومەتە خراپەکارەکان و هاوکات ئەمە بووبووە هۆکارێك بە چەوساندنەوە و بێچارەبوونی خەڵکی. بەم هۆیەوە بوو پارێزەرانی کۆنفوشیانیزم بۆ راگرتنی لە بەرانبەر بودابیزم، بە لاساییکردنەوەی بودابیزم، دەستیانکرد بە

دروستکردنی پەرستگاکان، داهێنانی چەندین چیرۆکی بانئاسا لەبارەی کۆنفوشیۆس و فێرگەکەی و هاوکات کەسێتییەکی سیفەت-یەزدانیشیان بە کۆنفوشیۆس بەخشی.

## ٢-٦ فێرگەی دائۆ

دائۆییزم یەکێکی دیکە بوو لە نەیارە سەرسەختەکانی کۆنفوشیانیزم و ئەم دوو فێرگەیە، لە بنەڕەتدا جیاوازییان لەتەك یەکدیدا هەبوو. دائۆییزم ناخگەرا (یان دەروونگەرا)، سۆسیۆپات[٧٠] و بانگەشەی بێکرداری (یان پاسیڤێتی) دەکرد، و کۆنفوشیانیزم ڕواڵەتگەرا، سۆسیالیست و بانگەشەی ڕەچاوکردنی داب و نەریت و ڕێوڕەسمەکانی دەکرد. لەم ڕووەوە، لایەنگرانی دائۆییزم، پەیڕەوانی کۆنفوشیانیزمیان بە دۆگماتیست و ڕواڵەتگەرا تۆمەتبار دەکرد و باوەڕییان وابوو، کە هەموو هۆکارەکانی بەدبەختییە کۆمەڵایەتی و نیشتمانییەکان لە فێرکارییەکانی کۆنفوشیۆسەوە سەرچاوە دەگرن. پەیڕەوانی دائۆییزم دەیانگوت کۆنفوشیانیزم بە لەپێشتردانانی لی لە جیاتی دائۆ، بووەتە دەسوێژێك بەدەست دەستەڵاتدارانەوە بۆ چەوساندنەوەی خەڵکی داماو و هاوکات بووەتە هۆکاری دارمانی "دائۆ"ش. ئەوان باوەڕییان وابوو کۆنفوشیانیزم بە جەختکردنەوەی لەسەر یاسا و داب و نەریتەکان، لەگەڵ سوودخوازی دەستەڵاتداران، ئەمە بووەتە هۆی پەرێشانی و داماوی خەڵکی و ئەوانییان لە ناخی خۆیان دوورخستۆتەوە و سەرەنجام، بووەتە هۆکاری بڵاوبوونەوەی تەڵەکەبازی، ساختەکاری، ڕیابازی، تۆمەت بۆهەڵبەستن و درۆبێژی و...هتد.

---

٧٠ - ئەوانەی رقیان لە کۆمەڵگە و سیفەتە بەسەردا سەپێنراوەکانی کۆمەڵگە هەیە و لە کۆمەڵگە رادەکەن، بە فارسی پێیدەگوترێت جامعەستیز (وەرگێڕ)

## ٣-٦ فێرگەی مۆ[٧١]

فێرگەی "مۆ" لە لایەن دانایەکەوە بە ناوی "مۆ زی"[٧٢]یەوە دامەزراوە، کە ناوی خێزانیی "مۆ" و ناوە بچووکەکەیشی "تی"[٧٣] بوو. مێژووی ژیانی ئەو زۆر روون نییە. مۆ زی لە خێزانێکی هەژار، لە ویلایەتی "لو" هاتە جیهانەوە و نزیکەی لە نێوان ساڵەکانی ٤٧٩-٣٨١ی بەر لە مەسیح ژیاوە. گرنگترین سەرچاوە بۆ شارەزابوون لە ژیان و فێرکارییەکانی ئەو، کتێبێکە بە ناوی خۆی، ***مۆ زی***، کە برێتییە لە نووسینەکانی خۆی و پەیڕەوانی لە پەنجا و سێ بەشدا[٣٩].

مۆ زی لەتەك ئەوەی سەرەتا لە ژێر کاریگەری فێرکارییەکانی کۆنفوشیۆسدا بوو، بەڵام درەنگترێك ڕێگەیەکی دیکەی گرتەبەر، کە لە زۆر لایەنەوە ناکۆکی و جیاوازی لەتەك فێرکارییەکانی کۆنفوشیۆسدا هەبوو و ئەم ناکۆکی و جیاوازییانە بوونە هۆکاری ئەوەی ئەو و پەیڕەوانی، بکەونە رەخنەگرتن لە کۆنفوشیانیزم. هەڵبەت رەخنەگرتنەکەی ئەو لە کۆنفوشیانیزم و فێرگەکانی دیکە، دەگەڕایەوە بۆ بنەما تایبەتییە داهێنراوەکەی. دوو پرەنسیپی سەرەکی لە پرەنسیپەکانی فێرگەکەی ئەو- سەرباری باوەڕبوون بە خودای کەسێتی "شانگ دی" (خودای دەستەڵاتدار)- برێتین لە: "خۆشەویستیی" و "کردارگەراییی". پرەنسیپەکانی دیکەی مۆ زی، لەبارەی حکومەت، مرۆڤی دانا و...، لەم دوو پرەنسیپە وەرگیراون[٤٠].

---

71- Mo

72 –Mo Zi

73 –Ti

مەبەست لە "خۆشەویستی"، خۆشەویستینواندنە بەرانبەر بە هەمووان و دووركەوتنەوەیە لە رق و كینە بەكارهێنان، كە دەتوانێت ئاشتی و ئارامی بۆ كۆمەڵگە بەدیبهێنێت. لە نێو پرەنسیپی "خۆشەویستی"دا، پرەنسیپێكی دیكە سەرچاوە دەگرێت بە ناوی "بێ زیانی" (راكردن لە زیانگەیاندن)، كە هەر جۆرە ئازار و زیانێك یاساغ دەكات. بەپێی پرەنسیپی "بێ زیانی" بوو، كە مۆ زی دژی هەر جۆرە جەنگ و ئاژاوەیەكی نێوان حكومەتەكان بوو و جەنگی بە هۆكار دەزانی، كە بەدبەختی بۆ مرۆڤ دەهێنێت.

مەبەست لە "كردارگەرایی"، ئەنجامدانی هەر كارێكە بە لەبەرچاوگرتنی سوودەكەی، كە گرنگی دەدات بە كار و لە بەرانبەر بێ كاری و بەفیڕۆدانی كات رادەوەستێت. مۆ زی باوەڕیی وابوو مرۆڤ دەبێت كارێك ئەنجام بدات، كە سوود و بەرژەوەندی لێ بەدەستبهێنێت. بە مانایەكی دی، هەر كاركردنێك پێویستە خاوەنی سوودێكی ژیرانە بێت. هەروەها بەپێی ئەم پرەنسیپە بوو مۆ زی دژی ئەنجامدانی هەندێك كاروبار بوو، كە دەرەنجامەكەی شتێك نەبوون جگە لە بەهەدەردانی سامان و بەرهەمێكیان نەبوو، جگە لە زیان.

بە وردبوونەوە لەم پرەنسیپانە، مۆ زی باوەڕیی وایە، كە پەیڕەوانی كۆنفوشیۆس بە چوار تێڕوانین، جیهانیان رووەو وێرانی ئاراستە كردووە (مۆ زی، بەشی ٤٨):

١- پەیڕەوانی كۆنفوشیۆس باوەڕییان بە بوونی خوداوەند و بە رۆحە ئاسمانییەكان نییە، كە دەرەنجامەكەی رەنجاندنی خوداوەند و رۆحە ئاسمانییەكانە.

٢- پەیڕەوانی كۆنفوشیۆس جەخت دەكەنەوە لەسەر جێبەجێكردنی رێوڕەسمی ناشتنی مردوو و سێ ساڵ پرسەدانان دوای مەرگی دایك و باوك، كە دەرەنجامەكەی بەهەدەردانی سامان و هێزی خەڵكییە.

٣- پەیڕەوانی كۆنفوشیۆس جەخت لەسەر مۆسیقاژەنین دەكەنەوە، كە دەرەنجامەكەی جگە لە بەفیڕۆدانی كات، شتێكی دیكە نییە.

٤- پەیڕەوانی کۆنفوشیۆس باوەڕییان بە چارەنووسێکی ناچارەکی هەیە، کە دەرەنجامەکەی سستی و بێکارییە.

کەواتە بە شێوەیەکی گشتی، رەخنەگرتنەکەی مۆ زی لە کۆنفوشیانیزم دوو رەهەندی هەیە:

یەکێکیان پابەندبوون بە رێوڕەسم و تەشریفات، کە دەبێتە هۆی بەفیڕۆدانی کات و سامان و دوورکەوتنەوە لە لایەنی رۆحانی و، ئەویدیکەیان باوەڕبوون بە چارەنووسێکی ئاسمانی، کە دەبێتە هۆی سستی و تەنبەڵی مرۆڤ.

مۆ زی دەڵێت: "تەنانەت کەسە بە تەمەنەکانیش، ناتوانن زانستێکی پێویست بۆ فێربوونی رێبازی [کۆنفوشیۆس] بەدەستبهێنن. تەنانەت مرۆڤە بەهێزە گەنجەکانیش ناتوانن تەواوی ئەرکەکانی رێوڕەسم ئەنجام بدەن. تەنانەت ئەوانەی سامانێکی زۆریشیان کۆکردۆتەوە، ناتوانن بۆ ئەنجامدانی بەرنامەکانی مۆسیقا خەرجییەکی زۆر دابین بکەن. پەیڕەوانی کۆنفوشیۆس بۆ بە جوانی نیشاندانی هونەرە ئیبلیسییەکان چەندین رێگەی فێڵبازانە دەبرن و هاوکات دەبنە هۆکاری دارمانی لایەنی رۆحانی خۆیان. رێبازی ئەوان ناتوانێت پێداویستییەکانی ئەم رۆژگارە دابین بکات و زانستەکەیان ناشێت بۆ پەروەردەکردنی خەڵکی". (مۆ زی، بەشی ٣٩).

## ٤-٦ فێرگەی فا[٧٤]

فێرگەی "فا" یان فێرگەی "یاسا" لە ماوەی دوو سەدە (لەساڵی ٤٢٥-٢٢٥ی بەر لە مەسیح)، کە وەها دووچاری پشێوی و پەرێشانییەکی سەخت بوو بوو و تەنانەت حکومەتی فیۆدالیش نەیدەتوانی بە پشت بەستن بە داب و نەریت و رێوڕەسمە کۆنەکان کارەکانی پێشبخات، بۆیە باسکردن لە دامەزراندنی حکومەتی یاسا بۆ گەڕاندنەوەی دیسپلین و جێگیری بۆ کۆمەڵگا، بەشێوەیەکی تازە بابەتی گفتوگۆ

74 - Fa

بوون. هەڵبەت بەر لەو قۆناغەش، فێرگەی یاسا هاتبووە ئارا، بەڵام پێکهاتەیەکی دیسپلین و دەوڵەمەندی نەبوو. فێرگەی یاسا لە قۆناغی پشێوی و نائارامیدا، خاوەنی چوار کەسێتیی بوو، کە چوارەمینیان (هان فی زی)، ناودارترین دانای ئەم فێرگەیەیە. هاوکات ئەم چوار کەسێتییەی فێرگەی یاسا⁽٤١⁾ بریتین لە:

١- **شێن دائۆ**[٧٥]: دەشێت ئەو هاوچەرخی مێنسیوس (٣٧٣-٢٨٩ی بەر لە مەسیح) بووبێت و گرنگترین پرەنسیپی ئەو، "شی"[٧٦] یان "ئۆتۆریتە"[٧٧]یە. مەبەست لەم پرەنسیپە بریتییە لەوەی گرنگترین فاکتەر بۆ جێگیربوونی حکومەتێك، ئۆتۆریتەی فەرمانڕەوا یان دەستەڵاتی ڕەهایە، کە توانستی فەرمانڕەوا لە بەڕێوەبەردنی کاروباری وڵات زێتر و بەرفرەوانتر دەکات.

٢- **شێن بو های**[٧٨]: لە ساڵی ٣٧٧ی بەر لە مەسیح کۆچی دوایی کردووە و گرنگترین پرەنسیپی ئەو، "شو"[٧٩] یان "دەوڵەتداری"[٨٠]یە. مەبەست لە "شو"، شێوازێکی حکومەت و دەوڵەتدارییە، کە تێیدا ژێردەستان ملکەچی فەرمانڕەوان و هیچ کەسێك دەسەڵاتی نافەرمانی نییە. بە گوتنێکی سادەتر، "شو" هونەری بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتە لەتەك مەردومداری (هەڵکردن لەتەك خەڵکی).

٣- **شانگ یانگ**[٨١]: لە ساڵی ٣٨٨ی بەر لە مەسیح کۆچی دوایی کردووە و گرنگترین پرەنسیپی ئەو، "فا" یان "یاسا"یە. مەبەست لە پرەنسیپی "فا"، بەکارهێنانی یاسایە بە لەبەرچاوگرتنی پاداشت و سزای باش، بۆ باش بەڕێوەبردنی

---

75 -Shen Dao

76 -Shi

٧٧ - دەستەڵاتدارێتی یان (اقتدار)

78 -Shen Bu Hai

79- Shu

٨٠ - یان بەڕێوەبردنی وڵات

81- Shang Yang

کاروباری وڵات. دەگێڕنەوە شانگ یانگ کۆمەڵێك یاسای داهێناوە، کە تێیدا گەورەتر و بچووکتر جیاوازییان نەبوو و هەمووان لە بەرانبەر یاسادا یەکسان بوون. ئەو جەختی لە سەر دوو هونەر "چاندن و جەنگ" دەکردەوە و پێشنیاری بۆ فەرمانڕەوا کرد، کە رەوشێك بێنێتە پێشەوە بۆ ئەوەی خەڵکی دوورکەوتنەوە لە جووتیاری بە کارێکی خراپ و نەجەنگان بە کارێکی مەترسیدار بزانن.

٤- **هان فی زی**[٨٢]: دوای ئەم سێ کەسە، ئێستا گرنگە باس لە گرنگترین کەسێتی فێرگەی یاسا، هان فی زی، بکەین. ئەو لە خێزانێکی حکومی لە نزیکەی ساڵی **٢٨١**ی بەر لە مەسیح، لە ویلایەتی "هان"[٨٣] هاتە جیهانەوە. ئەو یەکێك بوو لە شاگردە ناودارەکانی سون زی، کە درەنگترێك رێگەیەکی سەربەخۆی گرتەبەر و خۆی خەریکی لێکۆڵینەوە و وانەگوتنەوە کرد و کۆمەڵە تێڕوانین و فێرکارییەکانی لە کتێبێکدا بە ناوی خۆی، ***هان فی زی***، کۆکردۆتەوە. ئەو لە ساڵی **٢٣٣**ی بەر لە مەسیح و نزیکەی لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

هان فی زی لەتەك باوەڕبوونی بە خراپڕەوشتی مرۆڤ، دەیگوت پێویستە یاسا شوێنی داب و نەریت(ی مۆراڵی) بگرێتەوە، چونکە تەنها یاسا دەتوانێت مرۆڤی خراپڕەوشت، کە برێتین لە ئاکارنزمییەکانی[٨٤] وەکو خۆپەرستی و سوودپەرستی، کۆنترۆڵ بکات و سەرەنجام، کۆمەڵگا بەرەو ئاشتی و ئارامی ئاراستە بکات. لەم رووەوە، هان فی زی لە دەوڵەمەندکردن و فۆرمولەکردنێکی گشتی فێرگەی یاسا، رۆڵێکی گرنگی گێڕا. هەرچەندە ئەو هیچ داهێنانێکی لە بنەماکانی فێرگەی یاسادا نەکرد، بەڵام داهێنانەکەی ئەو برێتی بوو لە پێکەوەگرێدانی بنەماکانی سێ کەسێتییەکەی دیکەی فێرگەی یاسا. ئەو هەرسێ پرەنسیپی شی، شو و فای بەیەکەوە

82- Han Fi Zi

83- Han

**٨٤ - رذیلت**

بەستەوە و پێکهاتەیەکی دیسپلین و دەوڵەمەندی فێرگەی یاسای خستەڕوو[٤٢]، کە بریێتین لە:

١- (بە رەچاوکردنی شی) حکومەتێك لەتەك دەستەڵاتی رەهای فەرمانڕەوا.

٢- (بە رەچاوکردنی شو) دەوڵەتدارییەك لەتەك خۆبەسییەکی ئابووری و سوپایی.

٣- (بە رەچاوکردنی فا) جێبەجێکردنی یاساکان لەتەك پاداشت و سزادانی باش.

بە رەچاوکردنی بنەماکانی یاساییەکان، شتێکی ئاسایی بوو، کە کۆنفوشیانیزم بکەوێتە بەردەم رەخنەگرتنی ئەوان. کۆنفوشیانیزم لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکاندا، بە شێوەیەکی ئایدیالیستانە جەختی لەسەر لی (داب و نەریت و مۆراڵی پێشینان) دەکردەوە و بەرگری لە پرەنسیپەکانی حکومەتی نەریتی چاینی دێرین دەکرد. لە کاتێکدا فێرگەی یاسا لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکاندا، بە شێوەیەکی ریالیستانە جەختی لەسەر یاسا دەکردەوە — لەتەك پاداشت و سزا- لە جیاتی لی[٤٣].

لەم رووەوە، هان فی زی بە تانە و گاڵتەپێکردن بە کۆنفوشیانیزم، رەخنە لەوە دەگرێت، کە لە چاکسازیکردنی کاروبارەکاندا، هیچ کارێك بە رابردووگەرایی و نەریتگەرایی (یان نەریتپارێزی) ناکرێت و دڵخۆشبوون بە داب و نەریتەکانی دێرین، پەسەندکردنی شێوازی پێشینان و رووکردنە شیعر و مێژوو، کارێکی هەرزەکارانەیە و شێوازی رابوردوو دەبێت بە رابوردووان بسپێردرێت و شێوازی تازە و باش لەتەك رۆژگاردا پەرەبدرێت. هان فی زی دەیگوت: ئەگەر ئەمڕۆکە کەسێك پەیدا ببێت، کە شێوازەکانی پێنج دەستەڵاتدارە داناکەی کۆن (یائۆ، شون، یو، تانگ و وو) بۆ نەوەی نوێ پێشنیار بکات، ئەوا داناکانی ئەمڕۆ بەو پێدەکەنن. مرۆڤی دانا، مەیلی بەلای رابوردووی کۆنینە و پەیوەستبوون بە پرەنسیپی رۆژگارانی کۆندا نییە و کارەکانی رۆژگاری خۆی جێبەجێ دەکات و ئامرازی پێویست بۆ ئەو کارانە دەستەبەر دەکات[٤٤]. بەپێی ئەو تێڕوانینە، یاسا و حکومەت دەبێت لەتەك پێداویستییەکانی رۆژگاردا بگونجێن.

هان فی زی بە ئاوازێکی سەرزەنشتکارانە، هەرزەکارەیی ئەو کەسانەی دەیانەوێت بە گەڕانەوە بۆ رابوردوو، کێشەکانی رۆژگاری خۆیان چارەسەر بکەن، بەشێوەی چیرۆکێك

بەمجۆرە دەیگێڕێتەوە: "ڕۆژگارێك کەسێك لە ویلایەتی "سۆنگ"[٨٥] لە کێڵگەکەی خۆیدا خەریکی جوتیاری بوو. لە ناوەڕاستی کێڵگەکەدا، درەختێکی گەورە هەبوو. ڕۆژێك کەروێشکێك لە کاتی ڕاکردندا، بە خێرایی خۆی کێشا بە درەختەکەدا، ملی شکا و مرد. کەسەکە بە بینینی ئەم دیمەنە، وازی لە جوتیارییەکەی هێنا و بە ئومێدی ئەوەی کەروێشکێکی دیکە بەدەستبهێنێت، لە نزیکی درەختەکە ڕاوەستا. بەڵام هەرگیز نەیتوانی کەروێشکێکی دیکە بگرێت. سەرەنجام خەڵکی سۆنگ، گاڵتەیان بەو دەکرد. ئەگەر ئێوە بتانەوێت بە شێوازی حکومەتی فەرمانڕەوایانی دێرین، دەستەڵاتدارێتی بەسەر خەڵکی ئەمڕۆکەدا بکەن، ڕێك هەمان کارتان کردووە، کە ئەو کەسە کردی و لەتەنیشت دارەکە لە چاوەڕوانی کەروێشك ڕاوەستا... کەواتە کاروباری ژیان بەپێی کاتی خۆی جوڵە دەکات و پێشخستنەکانی کاریش دەبێت بەپێی کاروباری ژیان بێت". (هان فی زی، بەشی ٤٩).

لە کۆتایی ئەم توێژینەوەیەی سەبارەت بە فێرگە نەیارەکانی کۆنفوشیانیزمدا، پێویستە ئەوە بەیادبهێنینەوە، کە ڕاڤەکاران و پەیڕەوانی کۆنفوشیانیزمیش لە بەرانبەر فێرگە ڕەخنەگرەکاندا دانەنیشتوون و بە پلانی پێویست، هەم جەختیان لەسەر یەکێتیی ئایینەکانی "سان جیائۆ" (سێ ئایینی بوداییزم، دائۆییزم و کۆنفوشیانیزم)ی چاینی و هەم بۆ ڕاکێشانی سەرنجی گشتی و مانەوەی کۆنفوشیانیزم، بەشێکیان لە تایبەتمەندی فێرگەگانی دیکە وەرگرتووە (هەرچەندە بووەتە هۆی لادان لە کۆنفوشیانیزمی سەرەتایی). بۆ نموونە، ئەوان یەکەم بە چاولێکردن لە بوداییزم، چەندین پەرستگا و پەیکەریان بۆ کۆنفوشیۆس سازکردووە، دووەم بە چاولێکردن لە دائۆییزم، باوەڕییان هێناوە بە پلەیەکی سیفەت-یەزدانی بۆ کۆنفوشیۆس، سێیەم جۆرێك باوەڕیی گشتیی بە ئاسمان و ڕۆحە نادیارییەکانیان لە مۆییزم وەرگرتووە، و چوارەم پێکهاتەی دیوانی بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتییان لە فاییزم وەرگرووە[٤٥].

---

85– Song

## ٧-كۆنفوشیانیزمی نوێ

ولاَتی چاین دوای چەندین سەدە نائارامی و دووبەرەکی، لە ساڵی ٥٨٩ی زایینی، بەهۆی زنجیرەی "سوی"[٨٦] (٥٩٠-٦١٧ی زایینی) جارێکی دیکە یەکپارچەیی و یەکێتی هاتە ئاراوە، بەلاَم دوای ماوەیەك ئەم زنجیرەیە، لەلایەن زنجیرەی "تانگ"[٨٧] (٦١٨-٩٠٦ی زایینی) کۆتایی پێهات. لە قۆناغی دەستەلاَتدارێتی تانگ، کە بە قۆناغی زێڕینی چاین ناسراوە، رێبازی کۆنفوشیۆس جارێکی دیکە هاتەوە ئارا، دەقەکانی کۆنفوشیۆس لەنوێوە برەویان پەیداکردەوە و چەندین پەرستگا بۆ کۆنفوشیۆس چێکران، بەلاَم سەرباری ئەمە، کۆنفوشیانیزم نەیتوانی پێش بە نەیارەکانی وەکو بوداییزم و دائۆییزم بگرێت.

بە شێوەیەکی پوخت، دەتوانین بلێین سێ فێرگە رۆڵیان هەبووە لە دەرکەوتنی کۆنفوشیانیزمی نوێدا[٤٦]: کۆنفوشیانیزم، بوداییزم، و دائۆییزم. داناکانی رۆژگار بە زیرەکییەکی داناییانە و بە لەبەرچاوگرتنی رەوشی رۆژگار، هەوڵێکی زۆریاندا بۆ ئەوەی جۆرێك یەکێتی لە نێوان ئەم سێ فێرگەیەدا بهێننە ئاراوە.

---

86 - Sui

87- Tang

له کۆتاییەکانی دەستەڵاتدارێتی زنجیرەی تانگدا، دوو کەس بە ناوەکانی "هان یو"[88] (٧٦٨-٨٢٤ی زایینی) و "لی ئائۆ"[89] (له ٨٤٤ی زایینیدا مردووە) هەوڵیاندا خوێندنەوەیەکی نوێی دەقەکانی کۆنفوشیۆس بخەنەڕوو تا بەم هۆیەوە کۆنفوشیانیزم زیندوو بکەنەوە، بەڵام هەوڵەکەی ئەوان بەرهەمێکی ئەوتۆی نەبوو و رەوتی بیرکردنەوەی ئەوان تا سەدەی یازدەیەمی زایینی بەردەوامی نەبوو.

هەوڵە تازەکان بۆ زیندووکردنەوەی کۆنفوشیانیزم و هێنانەئارای نیۆکۆنفوشیانیزم (یان کۆنفوشیانیزمی نوێ)، لەم سێ قۆناغەدا کورت دەبنەوە:

**قۆناغی یەکەم:** یەکەمین هەوڵی جدی بۆ هێنانەئارای کۆنفوشیانیزمی نوێ بە تێڕوانینێکی ئۆنتۆلۆژییانە[90]، لە سەدەی یازدەیەمی زایینیدا لە سەردەمی دەستەڵاتدارێتی زنجیرەی "سۆنگ"دا هاتە ئاراوە، بەهۆی ئەو دانایانەی مەبەستییان دارشتنی تێڕوانینێکی تازە بوو بە رەچاوکردنی بنەماکانی جیهانناسی (یان کۆسمۆلۆژی) کۆنفوشیانیزم. ئەم دانایانە برێتین:

١- جۆو دون یی[91] (١٠١٧-١٠٧٣ی زایینی)

٢- شائۆ یۆنگ[92] (١٠١١-١٠٧٧ی زایینی)

٣- جانگ زای[93] (١٠٢٠-١٠٧٧ی زایینی)

هەوڵی ئەم سێ دانایە بووە هۆی ئەوەی کۆنفوشیانیزم دووبارە ببێتە جێ سەرنجی بیرمەندان و خەڵکی.

**قۆناغی دووەم:** لەم قۆناغەدا کۆنفوشیانیزمی نوێ لە فۆرمی دوو فێرگەی تازەدا، بەهۆی دوو برا هاتە ئاراوە، کە برێتی بوون لە:

---

88- Han Yu

89 Li Ao

٩٠- بوونناسییانە

91- Zhou Dun Yi

92- Shao Yong

93- Zhang Zai

**١- فێرگەی لی (فێرگەی بنەڕەت):** چێنگ یی[٩٤] (١٠٣٣-١١٠٨ی زایینی)- کە برای بچووکتر بوو- فێرگەیەکی داهێنا و بەهۆی "جو سی"[٩٥] یان "جو زی" (١١٣٠-١٢٠٠ی زایینی) پەرەیسەند. فێرگەکەی ئەو بە فێرگەی "چێنگ جو"[٩٦] و "لی سوئە"[٩٧] یان فێرگەی "لی" (فێرگەی بنەڕەت) ناسرا.

**٢- فێرگەی سین (فێرگەی هۆش):** چێنگ هائۆ[٩٨] (١٠٣٢-١٠٨٥ی زایینی)- کە برای گەورەتر بوو- فێرگەیەکی داهێنا و بەهۆی "لو جیو یوان"[٩٩] (١١٣٩-١١٩٣ی زایینی) درێژەی پێدرا و بەهۆی "وانگ شۆ ژێن"[١٠٠] (١٤٧٣-١٥٢٩ی زایینی) ناسراو بە "یانگ مینگ"[١٠١]، پەرەیسەند. ئەم فێرگەیە بە فێرگەی "لو وانگ"[١٠٢] و "سین سوە"[١٠٣] یان فێرگەی "سین" (فێرگەی هۆش) ناووبانگی دەرکرد.

جیاوازیی ئەم دوو فێرگەیە لە رۆژگاری ژیانی ئەو دوو برایە دانایەدا، ئەوەندە بەرچاو نەبوو، بەڵام درەنگترێك ئەم جیاوازییە، بووە هۆی کێشمەکێش و رووبەڕووبوونەوەیەکی زۆر لە نێوان "جو سی" و "لو جیو یوان"دا.

**قۆناغی سێیەم:** ئەمە قۆناغی پەرەسەندنی دوو فێرگەی "لی" (بنەڕەت) و "سین" (هۆش)ـە، کە وەها دەیخەینەڕوو:

---

94 ـCheng Yi

95 ـ Zhu Xi

96 ـ Cheng Zhu

97 ـ Li Xue

98 ـ Cheng Hao

99 ـ Lu Jiu Yuan

100 ـ Wang Shou Ren

101 ـ Yang Ming

102ـ Lu Wang

103 ـ Xin Xue

**A. فێرگەی لی (فێرگەی بنەڕەت) لەتەك راڤەكردنی جو سی:** بیست و دوو ساڵ دوای مەرگی چێنگ یی (١٠٣٣-١١٠٨ی زایینی)، جو سی (١١٣٠-١٢٠٠ی زایینی) هاتە جیهانەوە. جو سی لە ناودارترین داناكانی كۆنفوشیانیزمی نوێیە. سەرباری ئەوەی دانایەكی پڕئیش بوو، هاوكات فێرگەی لی بە لوتكە گەیاند و ئەم فێرگەیەی كردە پڕكاریگەرترین فێرگەی فەلسەفەیی چاین. ئەم فێرگەیە بە رەچاوكردنی تایبەتی بە پرەنسیپی لی، ئۆنتۆلۆژییەكی تایبەتیی دەخاتەڕوو.

جو سی باوەڕیی وایە هەر فێنۆمێن[١٠٤]ێك لە جیهاندا بۆ هەبوونی، پێویستی بە دوو شت هەیە: "لی" و "چی"[١٠٥]، كە راڤەكردنی ئەم دوانەش بەمجۆرەیە:

**لی:** ماتەریال[١٠٦] و بنەڕەتی هەرمانی هەر فێنۆمێنێك و باڵاترە لە هەر فۆرمێك[١٠٧]. لی تەواوە، نە كەم دەبێت، و نە زیاد دەبێت. لی جەوهەری هەر فێنۆمێنێكە و هاوكات هەر فێنۆمێنێكیش لی تایبەت بەخۆی هەیە. هەر فێنۆمێنێك لەبەر ئەوەی لە "لی"یەكی تایبەتییەوە هاتۆتە بوون، ئەوا لە سروشت و جەوهەرێكی تایبەتیش بەهرەمەندە. لی هەر شتێك، بەر لە هاتنە بوونی ئەو شتە بوونی هەیە. بۆ نموونە، بەر لەوەی كەشتییەك دروست بكرێت، ئەوا لی ئەو كەشتییە بوونی هەبووە و مرۆڤ تەنها "لی"یەكەی دۆزیوەتەوە[١٠٨]. بە پوختی لی هەمان دائۆ و سەرچاوەیەكە، كە هەموو شتێك بەهۆی ئەوەوە دێتە بوون.

---

١٠٤- دیاردە

105 – Qi

١٠٦- ماتەریال

١٠٧ - شكلێك

١٠٨ـ ئەم تێڕوانینە راستەوخۆ دەمانخاتە بەردەم تێڕوانینەكەی فەیلەسوفی گریكی پلاتۆن، كە جیاوازی لە نێوان دوو جیهاندا دەكات: جیهانی سەروێنەی ئایدیاكان و جیهانی دەروێنەی گۆڕاو. لای پلاتۆن ئایدیا هەرمانە و بەر لە هەموو شتێك هەبووە. پلاتۆن بە نموونەی كورسی روونی دەكاتەوە و دەڵێت دارتاشێك، كە كورسییەك دروست دەكات، ئەوا پێشووتر ئایدیای كورسی لە

**چی**: فۆرم و شێوەی هەر فێنۆمێنێکە. واتا هەمان ئەو شتەیە، کە فۆرم بە ماتەریال دەبەخشێت تا فێنۆمێنێك دێتە ئاراوە. فۆرم دەبێتە هۆی ئەوەی ماتەریالێك شێوەیەکی جەستەیی وەربگرێت و دیاربکەوێت.

جەوهەر و سروشتی هەر فێنۆمێنێك لە کاتی هاتنە بوونیدا پێویستی بە لی دەبێت. لی پەتی و بێ شێوە و بێ فۆرمە و توانستی ئافراندنی نییە، بەڵام چی فۆرمێنەرە و توانستی ئافراندنی هەیە. لی پەیوەست دەبێت بەو شتەی دەرشێوە و دەرفۆرمە، بەڵام چی پەیوەست دەبێت بە فۆرم و شێوەوە. سەرباری ئەمە، لی لەپێشترییەکی پلەیی بەسەر **چی**دا هەیە و هەر کاتێك **چی**یەك بوونی هەبێت، ئەوا لی لە نێویدا هەیە و چی بۆ چالاکبوونی پێویستی بە لی هەیە. هەموو بوونەوەران لە یەکگرتنی لی و چی هاتوونەتە بوون.

جوسی لە راڤەکردنی پەرەسەندنی فێنۆمێنەکاندا ئەوە دەخاتەڕوو، کە لی، هەر فێنۆمێنێك بە شێوەی نموونەی خوازراوی ئەو فێنۆمێنە و ئەوەی، کە دەبێت ببێت، دەخاتەڕوو و بەو قۆناغە تایبەتە دەڵێت "جی"[١٠٩] یان "ئەنجام"[١١٠]. کەواتە، هەر شتێك لی تایبەت بەخۆی هەیە، کە ئەو شتە بە **جی**یەکی تایبەتی دەگەیەنێت. هەروەها هەموو فێنۆمێنەکان **جی**یان هەیە، تەواوی جیهانی بوونیش خاوەنی جی یان ئەنجامێکە، کە پێی دەگوترێت "تای جی"[١١١] یان "ئەنجامی مەزن" و گشتگیرترین و باڵاترین ئەنجامە. جو سی دەڵێت هەر شتێك ئەنجامێکی هەیە، کە ئەنجامی **لی**یە و ئەو شتەی، کە ئەنجامی **لی**یە ئاسمان، زەوی و هەموو شتەکانی دیکە لەخۆ دەگرێت و دەیکاتە یەك. باڵاترین

---

جیهانی سەروێنەدا هەبووە و کاتێك ئەم مرۆڤە بەجەستە بووە و بەیادی هاتۆتەوە، بەڵام هەرچییەك بێت هەرگیز کورسییە دروستکراوەکە ناگاتە ئایدیای کورسییەکە. دەشێت لێرەدا بڵێین "لی" هەمان "ئایدیا"ی پلاتۆنە. (وەرگێڕ)

109 – Ji

١١٠ – غایت یان کۆتایی

111 –Tai Ji

ئەنجام یان ئەنجامی کۆتاییە. هەروەها دەڵێت ئەنجامی کۆتایی بەرزترین پلەی هەر فێنۆمێنێکە، کە لە دوای ئەو، هیچ شتێك ناتوانێت بوونی هەبێت و ئەو باڵاترین، پڕنهێنیترین و ناڕوونترینە و بەسەر هەموو شتێکدا سەروەرە. ئەنجامی کۆتایی لەتەك ئەوەی پەیوەستە بە جیهانی بوون و خاوەنی یەکێتییە، ئەوا لە نێو تاك تاکەی فێنۆمێنەکانی جیهانیشدا هەیە و لە رەوتدایە، بێ ئەوەی یەکێتییەکەی لە نێو بچێت و زۆر ببێت، بۆ نموونە رووناکی مانگ، کە بەسەر هەر فێنۆمێنێکدا دەدرەوشێتەوە و لە هەموو شوێنێکدا هەیە بێ ئەوەی دابەش و زۆر ببێت.

بە تێڕوانینی جو سی، تای جی هۆی یەکەمە، کە دەبێتە هۆی بزواندن و گۆڕانپێدانی جیهان لە دوو فۆرمی یانگ و یین، و یانگ و یین بە هەڵکردن لەتەك یەکدیدا، پێنج توخمە ماتەریالییەکەی جیهانیان (ئاو، خاك، ئاگر، کانزا و دار) هێناوەتە بوون.

B. **فێرگەی سین (فێرگەی هۆش) لەتەك راڤەکردنی وانگ شو جین:** ئەم فێرگەیە، کە لەلایەن چێنگ هائۆ (١٠٣٢-١٠٨٥ی زایینی) دامەزرا، دوای چوار سەدە بەهۆی وانگ شو جین (١٤٧٣-١٥٢٩ی زایینی) پەرەیسەند. بنەمای ئەم فێرگەیە جەختکردنە لەسەر "سین" (هۆش) و وانگ شو جین لەتەك پرەنسیپی دانانی هۆش، ئۆنتۆلۆژییەکی تایبەتی داڕشتووە.

وانگ شو جین تێڕوانینە ئۆنتۆلۆژییەکەی خۆی بە ناوونیشانی تیۆریی "زانستی پەتی"، بەمجۆرە دەخاتەڕوو: لە جیهانی بووندا تەنها یەك واقیعیەت بوونی هەیە و ئەویش هۆشە و هۆش هەمان ویژدانی خۆئاگاییانەی مرۆڤە. هۆش هەموو شتێکی جیهانە، هۆش **لی**یە، هۆش جیهانە، هۆش خوداوەندە و جیهان شتێك نییە جگە لە هۆش. هۆش ئافرێنەری جیهان و فێنۆمێنەکانی جیهانە، لە جیهاندا شتێك بوونی نییە، کە هۆش پێی نامۆ بێت و لە نێوان هۆش و جیهاندا هیچ جیاوازییەك نییە. ئەگەر ویژدانی خۆئاگاییانەی مرۆڤ لەنێو بچێت، ئەوا نە مرۆڤێك دەمێنێتەوە، نە ئاسمان و نە زەویش. کەواتە هۆش و جیهان، یەکێتییەکی رەهایان هەیە. کەواتە مرۆڤ

بە هەر ئەندازەیەك، كە ئاوێنەی هۆشی بێ خەوش بێت، ئەوا بە هەمان ئەندازە جیهانی حەقیقەت روون و ئاشكرا دەكات.

وانگ شو جین لە روونكردنەوەی "زانستی پەتی" و شێوازی گەیشتن پێی دەڵێت: پێویستە دەست بە "سێ داو"ەوە بگرین تا بە مەبەست بگەین:

١- **داوی یەكێتی:** مەبەست لەم داوە، بوونی یەكێتییە لە نێوان مرۆڤ، ئاسمان، زەوی و بوونەوەرانی دیكە و بەم هۆیەوەیە، كە كاتێك منداڵێك دەكەوێتە نێو چاڵێكەوە، هەمووان هەستیان بۆی دەجولێت.

٢- **داوی خۆشەویستی:** مەبەست لەم داوە، خۆشەویستی و دڵسۆزییە بەرانبەر بە هەمووان. ئەم داوە، سەرباری ئەوەی پشت بەستە بە داوی یەكەم، ئەوا دەبێتە هۆی دەركەوتنی داوی یەكەمیش، واتا ئەم دوو داوە پێویست و دەروەست[112]ی یەكترین.

٣- **داوی بینایی:** مەبەست لەم داوە، ناسینی روون و ئاشكرای فێنۆمێنەكانە بەو جۆرەی لە ئارادان. ئەم داوە پشت بەستە بە داوی دووەم.

سەرەنجام ئەم سێ داوە دەگۆڕێن بۆ یەك داو (داوی یەكەم) و لە دەرەنجامدا، مرۆڤ بەهۆی ئەمەوە یەكێتی جیهانی بوون دەرك دەكات و ئەمەش هەمان "زانستی پەتی"یە.

---

١١٢ـ لازم و ملزوم

## پەراوێزەکان:

(1) John B. Noss, Man's Religions, p. 272.

(٢) چو جای و وینبرگ جای، تاریخ فلسفه چین، ترجمه ع. پاشایی، صص٦٢-٦٨.

(3) John B. Noss, p. 274.

(4) ibid.

(٥) یوسف اباذری و...، ادیان جهان باستان، ج١، ص٩٧.

(٦) فانگ یو-لان، تاریخ فلسفه چین، ترجمه فرید جواهرکلام، ص٦١.

(7) John H. and Evelyn Nagai Berthrong, Confucianism, A Short Introduction, p.25.

(٨) چو جای و وینبرگ جای، ص٥٨.

(9) John B. Noss, p.280.

(10) John H. and Evelyn Nagai Berthrong, p.89.

(11) John B. Noss, pp.282-283.

(١٢) چو جای و وینبرگ جای، ص٤٤.

(13) Jogn B. Noss, p.281.

(١٤) چو جای و وینبرگ جای، ص٤٦.

(١٥) همان، ص٤٨.

(١٦) فانگ یو-لان، ص٥٦.

(17) John B. Noss, p.284.

(18) Ibid.

(19) Ibid.

(20) Ninian Smart, The Religious Experience of Mankind, pp.206-207.

(٢١) چو جای و وینبرگ جای، صص٧٧-٧٨.

(٢٢) فان یو-لان، ص٩٢.

(٢٣) همان، ص٩٤.

(٢٤) چو جای و وینبرگ جای، ص٩٠.

(25) John B. Noss, p.291.

(٢٦) فانگ یو-لان، ص١٠٠.

(٢٧) همان، ص٩٩.

(٢٨) چو جای وینبرگ جای، ص٩٨.

(٢٩) فانگ یو-لان، ص١٠٤.

(30) John B. Noss, p.292.

(٣١) چو جای و وینبرگ جای، ص٢٠٧.

(٣٢) همان، ص٢١٠.

(٣٣) همان، صص٢١١-٢١٢.

(٣٤) فانگ یو-لان، ص١٩١.

(٣٥) همان، صص١٩٣-١٩٦.

(٣٦) چە جای و وینبرگ جای، ص٢١٥.

(٣٧) همان، صص٢١٨-٢١٩.

(٣٨) همان، صص٢٢٠-٢٢١.

(٣٩) فانگ یو-لان، ص٦٦.

(٤٠) چو جای و وینبرگ جای، ص٢٠١.

(٤١) همان، ص٢٤٩-٢٥٣.

(٤٢) همان، ص٢٦٧.

(٤٣) فانگ یو-لان، ص٢١٩.

(٤٤) چو جای وینبرگ جای، ص٢٥٨.

(45) John B. Noss, p.297.

(٤٦) بابەتەکانی ئەم باسە، وەرگیراون لە چوار بەشی کتێبی: تاریخ فلسفه چین، فانگ یو-لان، از ص٣٥٢ تا ص٤٢٠.

لەم بەشەدا، بۆ گواستنەوەی سیتاتەکانی دەقەکان، سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:


- Da Xue, Trans. by Charles Muller (Internet Copy)
- Da Xue, Trans. by James Legge (Internet Copy)
- Jung Yung, Trans. by Charles Muller (Internet Copy)
- Jung Yung, Trans. by James Legge (Internet Copy)
- Li Ji, Trans. by James Legge (vols. 27 & 28 of Sacred Books of the East)
- Lun Yu, Trans. by Charles Muller (Internet Copy)
- Lun Yu, Trans. by James Legge (Internet Copy)
- Mencius, Trans. by Charles Muller (Internet Copy)

- Mencius, Trans. by James Legge (Internet Copy)
- Shi Jing, Trans. by James Legge (vol. 39 of Sacred Books of the East)
- Shu Jing, Trans. by James Legge (vol. 3 of Sacred Books of the East)
- Yi Jing, Trans. by James Legge (vol. 16 of sacred Books of the East).
- یی جینگ (کتێبی گۆڕانەکان)، ترجمە سودابە **فضایلی**.

سەرچاوەی ئەم وەرگێڕانە: **دکتر فیاض** قرایی: ادیان خاور دور، دانشگاە فردوسی، مشهد، ١٣٨٥، ص١١٣-٢١٨.